# کاریگەرترین کەسایەتییەکانی جــــیــــهـــــان

نووسین و ئامادەکردنی:

خالیس جەمال عومەر

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ خوای مەزن ئەم هەلّەم بۆ ڕەخسا پەرتوکێک دانێم وە سوپاسی هەموو ئەو کەسانەش دەکەم تەنها بە وشەیەکیش زانستیان فێرکردبم  هەموو شتێک بە هەوڵ کۆشش دێتە دی ئەم پەرتوکەی لەبەردەستتانە باس لە کورتەیەک لە ژیانی کەسایەتییە کاریگەرەکانی مێژووی کۆن و نوێ دەکات لە سەرکردە سیاسییەکان و شۆڕشگێرەکان و زانایان و کەسایەتی ئاینی و فەیلەسوفەکان ....هتد

ئەم کەسانەش بە باش و خراپ ڕۆلیان لەسەر ئەم جیهاندا هەبووە و تاکو ئێستاش کاریگەرییان ماوە

زۆرینەی ئەو ڕووداوانەی لەم زەوییە ڕوو دەدات هەمیشە دەستی وڵاتێک یان ڕێکخراوێک و چەند کەسایەتییەکی لە پشتە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بە تایبەتی وڵاتە زلهێزەکان کە چەندین دەزگا و ڕێکخراو لە ژێر سەرپەرشتی چەند کەسایەتییەکی گرنگ بەرێوەدەبردرێ  لە دواییدا باسیان لێوە دەکەین.

# پێغەمبەری ئیسلام

# موحەممەد(دروودی خوای لێ بێت)

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلە کوڕی عەبدول موتەلیب، موسڵمانان بە پێغەمبەری خوای دادەنێن نێردراوە بۆ هەموو مرۆڤایەتی تا خەڵک بگەڕێنێتەوە بۆ یەکتاپەرستی و پەرستنی خوا لەسەر ڕیبازی ئیبراهیم، و لەو باوەڕەدان کە باشترینی دروستکراوانی خوایە و پێشەوای مرۆڤە، لەگەڵ ناوهێنانیدا دەڵێن «صلی الله علیه وسلم» واتە« دروودی خوای لێبێت»، کە لە قورئان و سوننەتدا ئەوە هاتووە، وایان لێدەکات سڵاواتی لەسەر بدەن. نووسەری یەهوودی مایکل هارت لە دانانی کتێبی مەزنترین ١٠٠ کەسایەتی مێژوودا، پێغەمبەر موحەممەدی داناوە بە بە مەزنترین کەس بەو بڕوایەی «کە تەنها کەسە لە مێژوودا بە تەواوی سەرکەوتوو بووە لەسەر ئاستی ئایینی و دونیایی و دەڵێت موحەممەد کاریگەرییەکی گەورەی لە دەروونی موسڵمانان بە جێهێشتووە، ئەمەش دەردەکەوێت لە یادکردنەوە و شوێن پێ هەڵگرتنییاندا لە شێوازی ژیان و پەرستشەکانی، و هەروەها لە هەستانیان بە لەبەرکردنی ووتە و هەڵس وکەوت و سیفەتەکانی».

لە دایک بووە لە مەککە لە مانگی ڕەبیعولئەولی ساڵی فیل، بەرامبەر ساڵی ٥٧٠ یان ٥٧١ی زایینی، پێش ئەوەی لە دایک بێت باوکی کۆچی دوایی کردوە و هەر لە منالێشدا دایکی لەدەست دەدات، پەروەردە دەبێت لای عەبدول موتەلیبی باپیرەی پاشان لای ئەبو تالیبی مامی، کە لەو ماوەیەدا خەریکی شوانی دەبێت، پاشان بازرگانی دەکات، لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا ژیانی هاوسەری پێک هێناوە لەگەڵ خەدیجە کچی خووەیلید، کە دایکی هەموو منالەکانی بووە بێجگە لە ئیبراهیم.

لە پێش ئیسلامدا حەنیفی بووە و خوای پەرستووە لەسەر ڕیبازی ئیبراهیم و پەرستنی بتی ڕەتکردۆتەوە کە لەو کاتانەدا بەربڵاوبووە لە مەککەدا، موسڵمانان لەو باوەڕەدان کە نیگای خوای پێ گەیشتووە کاتێک لەتەمەنی چل ساڵیدا بووە، سێ ساڵ بە نهێنی بانگەوازی کرد، پاشان دە ساڵی لە مەککە بە سەر برد بە بانگ کردنی خەڵکەکەی و بازرگانەکان و سەردانکەرانی کەعبە کە دەهاتنە مەککە، و لە ساڵی ٦٢٢ز کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە کە ناودەبرا بە یەسرب، دوای ئەوەی گەورەکانی قوڕەیش

**کەوتنە پیلان گێڕان لێی و بانگەوازەکەیان ڕەت دەکردەوە، دە ساڵی کۆتایی ژیانی لە مەدینە بەسەر برد بە بانگەوازی ئیسلامی، و بناغەی شارستانی ئیسلامی دانا، کە دواتر فراوان بوو و مەککە و هەموو شار و هۆزە عەرەبیەکانی گرتەوە، و بۆ یەکەم جار عەرەبی یەکخست لەسەر یەک ئاینی یەکتاپەرستی و لە دەوڵەتێکی یەکگرتوودا, لە ساڵی ٦٣٢ کۆچی دوایی کردووە..**

# (عەلی کوڕی ئەبووتالیب)

باوکی حەسەن عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کوڕی مامی پێغەمبەر بووە و هاوسەری فاتمەی کچی بووە و لە (ئالی بەیت)ە و لە هاوەڵەکانیەتی، و چوارەم خەلیفەی ڕاشدینە

عەلی کوڕی ئەبوتالیبی کوڕی عەبدول موتەلیب کوڕی هاشم لە مەککە لە ساڵی ٥٩٩ زایینی یان ٣٠ساڵ دوای ساڵی فیل لە دایک بووە. باوکی عەلی، پێغەمبەر محەممەدی ڕاسپاردووە بۆ پەروەردەکردنی عەلی لە دوای مردنی خۆی.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب ئیسلام بووە پێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە کاتێک مناڵ بووە و ئەڵێن دووەم یان سێیەم کەس بووە کە چۆتە ئیسلامەوە و یەکەم لاو بووە کە موسڵمان بووە، دوای ئەوە کە پێغەمبەر ئیسلامی ڕاگەیاند بە نزیک و کەسوکاری خۆی لە بەنی هاشم بۆ جێبەجێکردنی

ئەوەی لە قورئاندا هاتبوو، بەڵام کاتێک
بانگەوازی بۆ کردن کەس وەڵامی نەدایەوە عەلی
نەبێت. هەروەک عەلی کۆچی نەکرد بۆ حەبەشە
کاتێک پێغەمبەر ڕێگەی دا کۆمەڵێک لە
موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە دوای ئەوەی
بێباوەڕەکان زۆر ئازاریان ئەدان، لە مەککە
مایەوە و ئازاری چەشت بە دەستی قوڕەیش.

عەلی کاتێک تەمەنی ٢٢ ساڵ بوو بۆ مەدینە
کۆچی کرد. پێغەمبەر کاتێک برایەتی خستە نێوان
موسڵمانان لە دوای کۆچکردن، برایەتی خستە
نێوان عەلی لەگەڵ خۆیدا، و فاتمەی کچی کردە
هاوسەری لە ساڵی ٢ ی کۆچیدا.

عەلی جێگەی متمانەی پێغەمبەر بوو و یەکێک
بوو لەوانەی قورئانی ئەنوسیوە. و یەکێک بوو
لە نوێنەرەکانی کە پەیامەکانی پێغەمبەریان
ئەگەیاند و هۆزەکانیان بانگ ئەکرد بۆ ئیسلام،
هەروەک ڕۆڵی هەبوو لە کوژاندنەوەی ناکۆکی
نێوان هەندێک لە هۆزەکان.

**لە دوای کوژرانی عوسمان، موبایەعە درا بە عەلی لە مەدینە لە ساڵی ٣٥ی کۆچی، ئەوانەی لە مەدینە بوون لە هاوەڵ و شوێنکەوتوو و ئەوانی تر موبایەعەیان دا بە عەلی، و زۆر لە گێڕانەوەکان ئەڵێن کە نزیکەکانی عوسمان و ئەمەوییەکان موبایەعەیان نەدا بە عەلی و بەرەو شام ڕۆیشتن، و هەروەک ئەڵێن هاوەڵە گەورەکانی وەک سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و زۆری تر موبایەعەیان نەدا بە عەلی بەڵام بەڵێنیان دا کە لێی هەڵنەگەڕێنەوە.**

**بەم شێوەیە عەلی بووە جێنشینی عوسمان لە کاتێکا دەوڵەتی ئیسلامی درێژدەبوویەوە لە بەرزاییەکانی ئێرانەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو میسر لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ هەموو نیمچەدوورگەی عەرەبی و هەندێک لە ناوچە سنوریەکان جێگیر نەبوون، لە سەرەتای گرتنە دەستی خەلافەتدا عەلی ڕایگەیاند کە بنەماکانی**

ئیسلام جێبەجێ دەکات و دادپەروەری و یەکسانی بڵاو دەکاتەوە بە بێ جیاوازی، هەروەک وتی ئەو پارەیە ئەگێڕێتەوە کە عوسمان بڕیویەتی بۆ نزیکەکانی لە بەیتو لمالی موسڵمانان، و لە ساڵی ٣٦ی کۆچی عەلی فەرمانی دا بە لادانی والیەکانی عوسمان داینابوون، کە لەم هەنگاوەدا، لایدا لە ئامۆژگاری زۆر لە هاوەڵەکانی وەک ئیبن عەباس و موغەیەرەی کوڕی شوعبە کە پێیان وت کە ئەو بڕیارە دەر نەکات.

## کۆچی دوایی

کاتێک عەلی نوێژی بەیانی ئەکرد بە موسڵمانان لە مزگەوتی کووفە، لە کاتی نوێژەکە عەبدول ڕەحمانی کوڕی مەلجەم شمشێرێکی ژاراوی دا لەسەری، و سێ ڕۆژ دوای ئەوە عەلی کۆچی دوایی کرد لە ساڵی ٤٠ی کۆچی، لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا، عەبدول ڕەحمانی کوڕی مەلجەم یەکێک بوو لە خەواریجەکان، عەلی کوڕی ئەبو تالیب کۆچی دوایی کردوو و ئاژاوەیەکی هەڵگیرساو بە

**جێ ما لە ناو موسڵمانان، حەسەنی کوڕی خەلافەتی گرتە دەست و خەڵکی کوفە موبایەعەیان دا پێی، ٦ مانگ خەلافەتەکەی بەردەوام بوو پاشان دابەزی لە حوکم بۆ معاویە کوڕی ئەبووسوفیان بۆ ڕێگرتن لە خوێن ڕشتنی موسڵمانان، ئەمەش لە کاتێکا بوو سوپاکەی حەسەن لاواز بوو لە دوای کوشتاری خەواریجەکان و بەو مەرجە ڕێکەوت لەگەڵ معاویە کە لە دوای مردنی معاویە خەلافەت بگەڕێتەوە بۆ حەسەن و حسەینی برای، لە دوای مردنی حەسەن و معاویە، حسەین شۆڕشەکەی ڕاگەیاند لە دژی یەزیدی کوڕی معاویە کە بووە هۆی کوژرانی حسەین لە کارەساتی کەربەلا لە ڕووبەڕوونەوەی سوپای یەزیددا.**

# (سەلاحەدینی ئەیوبی)

ئەبوو موزەففەر یووسفی کوڕی ئەییووب ناسراو بە سەلاحەدینی ئەیوبی (٢٥ی کانوونی یەکەمی ١١٣٧- ٤ی ئازاری ١١٩٤ ) کوردێکی سەرلەشکەری موسڵمانان بوو کە دەوڵەتی ئەییووبیی دامەزراند. سەلاحەددین ساڵی ١١٣٨ لە قەڵای تکریت لەدایک بووە ,

سەرەتا لەدژی فاتیمییان و دوایی لەدژی خاچپەرستان (ئەو مەسیحییانەی کە چووبوون خاکە پیرۆزەکان لە فەلەستین بۆ ئۆلی خۆیان بپارێزن) دەرکەوت و شاری قودسی پاش سەد ساڵ خستەوە دەستی موسڵمانان.

سەلاحەددین لە خێزانێکی کوردی سەر بە یەکێک لە هۆزە کوردییە ناودارەکان بە ناوی هۆزی ڕەوادی لەدایک بووە. شوێنی نیشتەجێبوونی هۆزی ڕەوادیش لە نزیک شارۆچکەی دوین لە ئەرمەنستاندا بووە, ئەییووبییەکانیش دەدرێنە پاڵ ئەییووبی کوڕی شادی.

**لە دیمەشقدا سەلاحەددین فێری زانستە ئیسلامییەکان، هونەرەکانی سوارچاکی، ڕاو، تیرهاوێژی و پێداویستییەکانی تری پاڵەوانێتی بوو. کاتێک نوورەددین زەنگی لە ساڵی ٥٣٤ی کۆچی بەعلبەکی داگیر کرد، نەجمەددین ئەییووبی کرد بە والیی ئەوێ. پاشان، نەجمەددین چوو بۆ دیمەشق و بەم شێوەیە سەلاحەددین تەمەنی منالێیی لە بەعلەبەکدا بەسەر برد.**

**دوای ئەوەی سەلاحەددینی ئەییووبی ساڵی ١١٩٣ مرد، دەوڵەتی ئەییووبی لەنێوان کوڕەکانیدا بەش کرا و ئیتر ئەو هێزەی سەردەمی سەلاحەددینی پێ نەما.**

**سەلاحەددین موسڵمانی سوننە بوو و بە لێخۆشبوون و هەڵسوکەوتی مرۆڤانەی لەگەڵ دوژمنەکانی ناوی دەرکردبوو..**

## (ئیبن سینا)

ئیبن سینا زانایەکی گەورەی موسوڵمانی فارسی بوو. ناوی تەواوی (ئەبو عەلی حسێن کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی سینا)یە، لە ڕۆژئاوادا بە (Avicenna) ناسراوە، لە ساڵی ٩٨٠ز لە شاری ئەفشانش لە نزیک شاری بوخارا (ئوزبەکستانی ئێستا) لە دایکبووە. زمانی دایکی ئبین سینا فارسی بووە. خوێندنی سەرەتایی لە بوخارادا بووە. لە هەموو تەمەنێکیدا بلیمەتی ناو بلیمەتەکان بووە.

ئیبن سینا، ئەو فارسەی کە تەواوی ژیانی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئێران بەسەربرد، لە بوخارا لەدایکبووە، لەو شوێنەی کە سەرەتایترین خوێندنی تیایدا وەرگرت لە ژێر چاودێری باوکیدا. هەر لەبەر

ئەوەی ماڵی باوکی شوێنێک بوو بۆ چاوپێکەوتنی پیاوە ڕۆشنبیرەکان، ئیبن سینا هەر لە سەرەتای منداڵییەوە توانی سوود وەربگرێت لە هاوڕێیەتی کردنی مامۆستا دەرکەوتووەکانی ڕۆژگاری خۆی. منداڵێکی پێگەیشتوو بوو بە بیرێکی دەگمەنەوە، کە بە درێژایی ژیانی پارێزگاری لێکرد.

ئیبن سینا بەناوبانگترین پزیشک و فەیلەسووف و ئینسایکلۆپیدیست و بیرکاریناس و گەردووناسی سەردەمی خۆی بووە. بەشداری سەرەکی ئیبن سینا لە بواری زانستی پزیشکیدا بریتیە لە کتێبی قانون (القانون في الطب) کە لە ڕۆژئاوادا بە ( The Canon of Medicine) ناسراوە کە ئەم کتێبەی لە ساڵی ١٠٢٥ دا تەواوکردووە ، هەروەها ئەم کتێبە پێکهاتووە لە ئینسایکلۆپیدیایەکی دەرمان لە پێنج کتێبدا. نوسخەی عەرەبی کتێبی (القانون) لە ڕۆما دا

له ساڵی ١٥٩٣ز له چاپدراوه و بەمەش
یەکێکه له سەرتاییترین ئەو کتێبه
عەرەبیانەی که به چاپگەیەنراوه. ئەم کتێبه
له سەدەی دوازدەی زاییینیدا وەرگێردراوەته
سەر زمانی لاتینی. تاوەکو نزیکەی نیوەی
سەدەی پازدەیەمی زاییینی ئەم کتێبه پازده جار
به لاتینی و یەک جاریش به زمانی عیبری به
چاپ گەیەنراوه. لەم ساڵانەی دواییدا بەشێکی
لێ وەرگێڕدرایه سەر زمانی ئینگلیزی. له
سەدەی دوازده تا حەڤده کتێبی القانون وەک
ڕێبەری سەرەکی پزیشکی بەکارهێنراوه ،
وەک باسیش دەکرێت کاریگەری زۆری
کردووەته سەر لیۆناردۆ داڤینچی.

کتێنی "قانوون له پزشکیدا" له کتێبخانەی
مەقبەرەی ئیبنی سینا له هەمەدان

القیفتی ووتویەتی ئیبن سینا (٢١) کتێبی
سەرەکی و ( ٢٤) کتێبی لاوەکی لەسەر
بوارەکانی فەلسەفه ، پزیشکی ، ئایینناسی،

ئەندازەزانی و گەردووونناسی و سەرجەم بوارەکانی تر نوسیوە. بەڵام لە سەرچاوەیەکی تردا برۆکل مان پێی وایە ئیبن سینا (٩٩) کتێبی هەیە، (١٦) کتێبیان لەسەر پزیشکی ، (٦٨) یان لەسەر ئایینناسی و مێتافیزیک ، (١١) یان لەسەر گەردووونناسی و چواری دیکەیان لەسەر شیعرن. زۆرترینی کتێبەکانی بە زمانی عەرەبی نووسیوە.

ئەم زانایە لە سەردەمی زێرینی ئیسلامدا ژیاوە هەروەها چەندین داهێنان و لێکۆلینەوەی لە بوارە جیاوازەکانی کیمیا و فیزیا و بیرکاری ...هتد هەیە

لە هەمەدانیشەوە سەفەری بەرەو ئەسفەهان کرد ، ئەو شارەی کە زۆربەی نووسینە کاریگەر و بەناوبانگەکانی تێدا نووسی. سەرەڕای هەموو ئەمانە تا لە ژیاندا بوو لە هەوڵەکانی بەردەوام بوو بەڵام سەفەر و هەوڵە عەقلانیەکانی و پشێوی سیاسیی بە

تەواوی باری تەندروستیان تێکدا بوو ، تا لە کۆتاییدا گەڕایەوە بۆ هەمەدان و لەوێ لە تەمەنی ٥٨ساڵیدا واتە لە ساڵی (١٠٣٧ز) و لە مانگی ڕەمەزان دا کۆچی دوایی کرد و تا ئێستاش گۆڕەکەی پارێزراوە. پێش مردنی لەسەر جێگەی مردن سامانەکەی بەخشی بە هەژاران ، کۆیلەکانی ئازاد کرد و بە درێژایی سێ ڕۆژ پێش مردنی قورئانی دەخوێند...

## (لیۆناردۆ داڤینچی)

لیۆناردۆ دی سێر پییێرۆ داڤینچی؛ هەمووشتزان، ماتەماتیکەوان، ئەندازیار، پسپۆڕی لەش‌شیکردنەوە، وێنەکێش، پەیکەرتاش، بیناساز، گیاناس، مۆزیکزان و نووسەری بەناوبانگی خەڵکی ئیتاڵی لە ١٥ی

**نیسانی ساڵی ١٤٥٢ ی زایینی لەدایکبووە و لە ٢ی مایسی ساڵی ١٥١٩ کۆچی دوایی کردووە. لیۆناردۆ زیاتر وەک نموونەی سەرەتایی بنیامی ڕێنێسانس دەناسن، یاتری ناوبانگی لیۆناردۆ بۆ کێشانی دوایین شێو و مۆنالیزا بووە.**

**لیۆناردۆ لە سەردەمی خۆی وەک وێنەکێش ناوبانگی هەبوو و هەروا ئێستاش. دوودانە لە بەرهەمەکانی وا لە دونیادا ناسراون مۆنالیزا (Mona Lisa) و دوایین شێو (The Last Supper)، کە بە زیاترین ژمارە لە ڕوویەوە کێشرانەتەوە و کۆپی لێ هەڵگیراوە. هەروەها ئەمانە بە ئایینیترین تابلۆکانی تەواوی زەمەنەکان دەزانن و تەنها تابلۆی خوڵقاندنی ئادەم ( Creation of Adam) مایکڵ ئانجلۆ (Michelangelo) دەتوانێ بە ناوبانگیان بگاتەوە. وێنەکێشاوەکەی لیۆناردۆ بە ناوی**

پیاوی ڤیتروڤی (Vitruvian Man) وەک شاندەری فەرهەنگ چاو لێدەکرێ و لە سەر هەموو شتێک لە یۆرۆ (Euro) تاکوو کتێبی دەرس و تیشێرت، دووبارە کێشراوە. بە هۆی جۆراوجۆر تەنها ١٥ دانە لە بەرهەمەکانی لە پاش خۆی بەجێ ماوە؛ لەگەڵ ئەو چەند کارە پاشماوە، دەفتەری نووسینە تایبەتیەکانی خۆی کە بە چەندین کێشراوە، دیاگرامی تەکنیکی، وێنە کێشاوەکانی لە سرووشت و هێندێ لە بیرەوەریەکانی خۆی تێدابوو، ماوەتەوە، بۆ یارمەتیدانی خەڵکانی سەردەمانی دوای خۆی هەرواکە هونەرمەندی هاوسەردەمی مایکڵ ئانجلۆ وای کرد.

لێوناردۆ بۆ دارا بوونی بەهرەی خوڵقێنەری زۆری ستایش کراوە. ئەو سیمایەک لە هێلیکۆپتەر، تانک، یەکخەری تیشکی هەتاو و ژمێرەری بۆمان کێشاوەتەوە. هەروەها

تیئۆریایەکی ناتەواو لە سەر زانستی ناسینی پێستەکانی زەوی خستووەتە بەر دەست. هەڵبەت ژمارییەکی کەم لە ئایدیا سەرەکیەکانی کاتی ژیانی خۆی هاتنە دروستکردن بەڵام هێندێ لە خۆڵقێنراوە بچووکەکانی وەک قڕقڕیەکی خۆکار و پێکهاتەیەک بۆ تاقی کردنەوەی ئەندازەیی درێژبوونەوەی تەل هەر ئەو سەرەدەمە درووستکران. وەک زانا و تێگەیشتوویەک بووە هۆی پێشکەوتنی زانست لە بوارەکانی پێکهاتەی لەش و توێکاری، ئەندازیاری درووستکردنی شار، هایدرۆدینامیک و ئۆپتیک.

## ژیانی پێشکەوتوو، ١٤٧٦-١٥١٣

پێشینەی دادگایەک لە ١٤٧٦ نیشان ئەدات لێوناردۆ و ٣پیاوی لاوی دیکە تۆمەتبار کراون بە هێندی کاری سێکسی پێکەوە، بەڵام دواتر لەو تاوانە ڕزگار دەبن. لەو کاتەوە چی

تر پێشینەیەک سەبارەت بە کارەکانی تەنانەت شوێنی بەسەر بردنی ژیانی لەبەر دەست نیە؛ ئەگەرچی وادیارە کە لێوناردۆ لە نێوان ساڵانی ١٤٧٦ تا ١٤٨١ لە شاری فلۆڕەنس خاوەن کارفێرگەی تایبەت بە خۆی بووە. لە ساڵی ١٤٧٨ کێشانی وێنەیەک لە مێحرابی کەنیسەی St Bernard و لە ساڵی ١٤٨١دا کێشانی تابلۆی The Adoration of the Magi بۆ دەیری San Donato پێی سپێردرا. گرێبەستی کێشانی ئەو وێنە گرینگانە کاتێ لێوناردۆ بۆ میلان دەڕوات هەڵدەوەشێتەوە.

وەکوو وازاری بۆمان باس دەکات، لێوناردۆ لە بواری مۆسیقاشدا بەهرەی سەیری بووە؛ لە ١٤٨٢دا چەنگێک لە نوقرە بە ڕوخسارییی سەری ئەسپ درووست دەکات, Lorenzo de' Medici لێوناردۆ بۆ بردنی ئەو چەنگە وەک خەڵاتی مانەوەی ئاشتی دەنێرێ

بۆ شاری میلان لای لۆدۆڤیکۆ ئیل مۆرۆ Ludovico il Moro، دووکی میلان.
لێوناردۆ نامەیەک دەنێرێ بۆ لۆدۆڤیکۆ و باسی ئەو هەموو شتە جیاوازە دەکات کە دەتوانێ فێریان بێت لە بواری ئەندازیاریدا و هەروەها وەبیری دەهێنێتەوە کە دەتوانێ وێنەش بکێشێت.

لێوناردۆ لە ٢ ی مەی ١٥١٩دا لە Clos Lucé کۆچی دوایی کرد. فرانسیسی یەکەم، پاشای ئەو کات، ببوە هاوڕێی نزیکی، تەنانەت وەک ئەوەی وازاری پێمان دەڵێ، کاتی مردن، لێوناردۆ سەری لە باوش پاشادا بوو ؛ ئەگەر چی ئەمە لە لایەن هونەرمەندان بە تایبەت فەڕنسیەکان بۆ کارە هونەریەکان زۆر پێشوازی لێکراوە، بەڵام ئەمە زیاتر لە ئەفسانە دەچێ تاکوو ڕاستی. هەر وازاری دەڵێ کە لێوناردۆ لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی دەنێرێ بە شوێن پیاوی ئایینیدا تاکوو ددان

**بنێته سەر هەڵەکانی ژیانی تاکوو پاکی پیرۆز وەربگرێت. لێوناردۆ لە کەنیسەی Saint-Hubert لە قەڵای Amboise ناژرا. بە ئارەزووی خۆی تاکە ٦ سواڵکەر دەگەڵ تابووتەکەی ڕێگەیان پێوا. مێلزی هاوڕێ نزیکەکەی، بووە جێبەجێکەری کارەکان دوای مردنی و هەروا میراتگری، بۆیە پووڵ، وێنەکان، ئامێرەکان، کتێبخانە و بەرهەمە تایبەتیەکانی لێوناردۆ پاش مردنی کەوتە لای ئەو. لێوناردۆ بۆ نزیکەکانی هەرکام شتێکی میرات دانابوو. بۆ سالای شاگرد وا کاتێکی زۆریان پێکەوە بە سەر برد و وەک هاوڕێی بوو هەروا پێشخزمەتەکەی باتیستا Battista di Vilussis هەریەک نیوەی باخی مێوێکیان میراتی دانا. بۆ براکانی زەوی و زارێکی زۆر و تەنانەت بە ژنە خزمەتکارەکەی عابایەکی بەنرخی بەخشیبوو...**

# (ئەلبەرت ئەنیشتاین)

ئەلبەرت ئاینشتاین ;(لەدایکبوون ١٤ ی
ئازاری١٨٧٩ - کۆچی دوایی ١٨ی نیسانی
١٩٥٥)\ زانایەکی ئەڵمانی بوو کە توانی
پەرە بدات بە بیردۆزە ڕێژەییە تایبەتی و
گشتییەکان کە یەکێکە لە دوو پایەکانی فیزیای
مۆدێرن.\ ئەم زانایە زیاتر ناسراوە بەهۆی
یاسای یەکسانی بارستە-وزە (E = mc2)
کە ناسراوە بە "بەناوبانگترین هاوکێشەی
جیهان" وە هەروەها توانی خەڵاتی نۆبڵ بۆ
فیزیا لە ساڵی ١٩٢١ بەدەستای بهێنێت بۆ
پەرەپێدان و باسکردنی دیاردەی کاریگەری
کارۆڕووناکی و بە گشتی دادەنرێت بە

کاریگەترین فیزیازانی سەدەی بیستەم.
ئاینشتاین خەڵکی ئەڵمانیا بوو بەڵام لەبەر
دۆخی تایبەتی ئەڵمانیا لەو سەردەمە کۆچی
بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد و تا
کۆتایی ژیانی لەوێ مایەوە. ئەنیشتاین بە
باوکی فیزیای نوێ دادەنرێت. بیردۆزی لە
زۆر بوارەکانی بیرکاری و فیزیا و
گەردوونناسی و هەروەها زۆر بیروبۆچوونی
کۆکردۆتەوە لە هەریەکە لە کات و شوێن و
ڕووناکی و هێزی کێشکردن.

لە سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی
زانستیدا،ئاینشتاین پێی وابوو کە میکانیکی
نیوتنی ئیتر نەیدەتوانی یاساکانی میکانیکی
کلاسیکی و یاساکانی کادی
ئەلەکترۆمەگنەتیسی ڕێکبخات. کە ئەمەش
بووە هۆی سەرهەڵدانی و پەرەپێدانی
بیردۆزەکەی بەناوی بیردۆزی ڕێژەیی

تایبەت. دواتر هەستی بەوە کرد کە ناوەرۆکی بیردۆزی ڕێژەیی دەتوانرێت پەرەی پێ بدرێت بۆ یاساکانی کادی ڕاکێشان (gravitational fields). پاشان لەگەڵ بڵاوکردنەوەی دوایین بیردۆزی دەربارەی هێزی ڕاکێشان لە ساڵی ١٩١٦، پەڕەیەکیشی دەربارەی بیردۆزی ڕێژەیی گشتی بڵاوکردەوە.

بە درێژایی ژیانی ئاینشتاین سەدان کتێب و وتاری بڵاوکردەوە.وە هەروەها بێجگە لەو کارە زانستییانەی کە خۆی ئەنجامی دان چەندین کار پرۆژەی تری لەگەڵ زاناکانی تردا کرد بۆ نموونە (کارەکانی بۆس-ئاینیشتاین) و هەروەها ساردکەرەوەی ئەنیشتاین.

## بۆمبی ئەتۆمی

## ئەنیشتاین لە ساڵی ١٩٢١ لەو کاتەی کە خەڵاتی نۆبێلی لە فیزیادا وەرگرت

لە ساڵی ١٩٠٧دا یاسای یەکسانیی وزە و بارستایی دۆزییەوە. یاساکە دەڵێت: وزە = بارستایی * دووجای خێرایی ڕووناکی. بەپێی ئەم یاسایە دەتوانرێت چەندیەتیی وزەی جیاکراوی ناو ناوکی یۆرانیۆم بدۆزرێتەوە بە زانینی بارستاییەکەی و لەسەر ئەم بنچینەیەش بۆمبی ناوکی و هەروەها بۆمبی ئەتۆمی دروست کران. ئەلبێرت خاوەنی هەردوو بیردۆزی بەشیی تایبەتی کە بڵاو کرایەوە لە ساڵی ١٩٠٥، هەروەها بیردۆزی بەشیی گشتی، ئەمیشیان لە ساڵی ١٩١٥دا بڵاو کرایەوە، کە هەردووکیان لە بەرزترین ئاستی ئاڵۆزیدان.

یەکێک لە دۆزەرەوەکانی دیاردەی کارەبایی، ئەویش دیاردەی چوونەدەرەوە یان دەرپەڕینی ئێلیکترۆنەکان لەسەر ڕووی کانزاوە لە

**ئەنجامی بەرکەوتنی تیشکێک کە لەرەیەکی گونجاوی هەبێت لەگەڵی. سەلماندی کە تیشک لەو کاتەدا وەک تەن (Particle) هەڵسوکەوت دەکات. ئاینشتاین لێکۆڵینەوەی زۆری هەیە گرینگترینیان بیردۆزی ڕێژەییە بڵاوکراوەی ساڵی ١٩٢٣یە، وە پەرتووکی (نباه الکون) ئەمیشیان هی ساڵی ١٩٣٢ە.**

**ئاینشتاین لە بەرلین نیشتەجێبوو کە میوانەکانی لە سەرانسەری جیهان دەهاتن بۆ لای و گوێیان لە قسەکانی دەگرت، تا ساڵی ١٩٢٩ کاتێک تەمەنی گەیشتە پەنجا ساڵ بڕیاری ونبوونیدا و کەس نەیزانی لە کوێ دەژیت، لە ١٨ی نیسانی ساڵی ١٩٥٥ لە شاری پرینستۆن لە ویلایەتی نیوجێرسی لە ئەمریکا ئاینشتاین کۆچی دوایی کرد. زۆر لە زانکۆکان پێشبڕکێیان بوو تا مێشکی ئەم پیاوە بەدەست بهێنن تا نهێنیەکانی ئەم زانایە بزانن....**

## (ئیسحاق نیوتن)

سێر ئیسحاق نیوتن (لە ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٦٤٢ لەدایکبووە -لە٢٠ی ئازاری ١٧٢٧ کۆچی دوایی کردووە) فیزیکزان، بیرکار، ئەستێرەناس، فەیلەسوفی سروشتی، کیمیاگەر و زانای ئیلاهیاتی خەڵکی ئینگلیز و لە پیاوانی ئەنجومەنی پادشایی بوو. نیوتۆن لە لایەن لێکۆڵەران و خەڵکی ئاساییەوە وەکوو یەکێک لەو کەسانەی کە گەورەترین کاریگەریی لەسەر مێژووی مرۆڤ درووستکردوە دەناسرێت.

نیوتۆن لە وولّتروّپ مانۆری سەر بە ناوچەی لینکۆڵن شایەر لە دایکبووە کە باوکی کۆچی دوایی کرد ئەم لە سکی دایکیدا بووە بە سێ مانگ، پاش ئەوەی نیوتۆن تەمەنی بوو بە دوو ساڵ دایکی شویکردووە بە پیاویکی ترو نیوتۆنی لای نەنکی بەجێهێشت، نیوتۆن سەرەتای ژیانی بە کولە مەرگی و بەبێ دایک و باوک بەسەر برد، نەنکی هەوڵێکی زۆری دا بۆ پێگەیاندن و خستنە بەر خوێندنی، لە سالی ١٦٦١دا دواناوەندی تەواو کرد و لە شاری کامبریج لە کۆلێجی ترینیتی وەرگیرا، ئەو کۆلێجەی کە نیوتۆن دەستی بە خوێندن کرد تیایدا لەسەر ڕێچکەی فەلسەفی ئەرەستوو دەیان خوێند، بەلام نیوتۆن حەزی بە لێکۆڵینەوەی فەیلەسووفەکانی ئەو سەردەمەی خۆی دەکرد وەکوو دێکارت و گالیلێو گالیلەی و کۆپەرنیکۆس و یۆهانس کێپلەر. لە سالّی ١٦٦٥ دا نیوتۆن دەستی بە

داڕشتنی بیردۆزێک کرد کە لە پاشە ڕۆژدا بە (ژمێرەزانی زۆر بچووک) ناسرا کە بەشێکە لە بیرکاری، پاش ئەوەی کە نیوتۆن بڕوانامەی زانکۆی بە دەستهێنا لەو ساڵەدا نەخۆشی پەتا لە ئەورووپا بڵاوبوەوە کە بە پەتا گەورەکەی لەندەن ناسراوە، کە بووە هۆی داخستنی زانکۆکە، پاش بەجێهێشتنی زانکۆ نیوتۆن بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ماڵەوە مایەوە و خۆی بە لێکۆڵینەوەی (ژمێرەزانی و ئاوێزە و یاسای کێشکردنی زەوییەوە) سەرقاڵ کرد و پەرەیدا بە بیردۆزەکانی. لە ساڵی ١٦٦٧ گەڕایەوە بۆ زانکۆی کامبریج و وەکو هاوەڵی سیانەی پیرۆز کار بەدەست بوو.

پەرتووکەکەی بەناوی "پرەنسیپە بیرکارییەکانی فەلسەفەی سروشتی" (بە لاتین: Philosophiæ Naturalis Principia Mathematica) کە ساڵی

١٦٨٧ دەرچووە، بە یەکێک لەو پەرتووکانەی کە گەورەترین کاریگەریی لە سەر مێژووی زانستدا هەبووە دەژمێردرێت و بناغەی بۆ بەشیکی گەورە لە میکانیکی کلاسیک داناوە. لەم پەرتووکەدا، نیوتۆن وەسفی یاسای ڕاکێشانی گەردوونی و هەرسێ یاساکانی جووڵەی کردووە، کە زاڵێتی پەیدا کرد بەسەر ڕوانگەی زانستیی سێ سەدەی داهاتووی خۆیدا سەبارەت بە گەردوونی فیزیکی. نیوتۆن بە سەلماندنی تەبایی و جۆربوونی یاساکانی کیپلەر بۆ جووڵەی هەسارەیی لەگەڵ بیرۆکەی ڕاکێشانەکەی خۆی، نیشانی دا کە جووڵەی شتەکان لە سەر زەوی و جووڵەی تەنە ئاسمانییەکان یەک کۆمەڵە یاسای سروشتی دەستی گرتووە بەسەر هەردووکیاندا و بەم جۆرە هیچ گومانێکی لە دەوروپشتی بیرۆکەی ناوەندێتیی

خۆر نەهێشتەوە و ڕاپەڕینی زانستیی پێشخست.

نیوتۆن لە ژیانی خۆیدا ژنی نەهێناوە و کەسی لە پاش بەجێنەماوە. دوا ڕۆژەکانی ژیانی خۆی لە شاری لەندەن بەسەر برد و هەر لەو شارەش لە ڕۆژی ٢٠ی ئازاری ١٧٢٧ ماڵ ئاوایی لە جیهانکرد و لە گۆڕەپانی وێست مانچستەر ئابی تەرمەکەی بە خاک سپێردراوە.

## (نیکۆلا تێسلا)

نیکۆلا تێسلا (بە ئینگلیزی: Nikola Tesla) داهێنەر و موهەندیسی میکانیکی و کارەبای و فیزیازانی سیربی ئەمریکی لە

شاری سمیلجان لە کرواتیا لە دایك بووە لە ساڵی ١٨٥٦ ، ئێستا سمیلجان بەشێکە لە کرواتیا پێشوو تر لە ژێر دەسەڵات و سنوری پاشای نەمسا بوو ، باوکی تێسلا قەشە بوو هەرچەندە دایکی بێ ئیش و کار بوە و خوێندەواریەکی ئەو تۆی نەبووە بەڵام خاوەنی مێشکێکی بەهێز بووە و وە ئارەزووی لە بەکار هێنانی ئامێرە ئەلیکترۆنی و میکانیکیەکان بووە ، تێسلا دوا تر رەگەزنامەی ئەمریکی وەرگرتوە ، بەهۆی داهێنان و شۆرشەکانی لە بواری فیزیا و کارەبا و میکانیك و بە تایبەت لە ووزەی کارۆموگناتیسی ئەویش لە کۆتای سەدەی ١٩ و سەرەتاکانی سەدەی ٢٠ م ناوبانگی دەرکرد.

تێسلا بە گەورە ترین زانا و داهێنەری مێژوو بە درێژای سەدەکان دانراوە و هیچ گومانێکیش لە لێهاتووی ئەم کەسە نیە ، پێش

بینی و بینینەکانی تێسلا زۆر گەورە تر و لە پێش تر بوو لە چاو ئەو سەدەیەی تێیدا دەژیا وە هەروەها زۆر لە پێش زاناکانی تر بوو کی ئەو کاتە گەورە ترین مونافسی ئەدیسۆن بوو هەروەها پەیوەندیەکی زۆر کاڵی لەگەڵ ئەنیشتاین هەبوو بەڵام بە بینین چاویان بە یەك نەکەوتووە ، سەرەتای خوێندن لە قوتابخانەیەك بە ناوی پۆلیتەکنیك بووە پاشان خوێندنی زانکۆشی لە براگ تشیکیە تەواو کردوە و بڕوا نامەی وەرگرتوە ، سەرەتا لەگەڵ فیزیا و بیرکاری خۆی خەریك کردوو شارەزایەکی زۆر باشی هەبوو بەڵام زوو بە زوو بیر کردنەوەی گۆڕا و هاتە ناو بواری کارەبا و میکانیك چونکە کارەبا شتێك بوو لای ئەو تووشی سەرسورمانی کرد بوو.

لە ساڵی ١٨٩٨ بە هۆی ئەوەی تێسلا هەوڵی گەڕانەوەی نازناوی دۆزەرەوەی رادیۆی دا بۆ خۆی کە لێی دزرابوو ,کارگەکەی تێسلا

لەلایەن دەستێکی نادیارەوە ئاگری تێبەردرا و بە هۆیەوە گشت کەل و پەل و دۆزیینەوەکانی ناوی لە ناو چوون . لەماوەیەکی کەمدا تێسلا توانی گشت کەلو پەلەکان دروست بکاتەوە و دەستبکاتەوە بە دۆزینەوەکانی... لە سالّی ١٩٤٩ دادگایەکی ئەمەریکی مافی دۆزەرەوەی رادیۆی گەڕاندەوە بۆ تیسلا کە خاوەنی ئەسڵی دۆزەرەوەکەبوو و لە سالّی ١٨٩٣ دۆزیبوییەوە لە جیاتی مارکۆنی کە لە سالّی ١٨٩٤ دۆزینەوەی ڕادیۆی کە شفی کردبوو , وبەهۆیەوە توانیبوی خەڵاتی نۆبڵ لە فیزیا بە دەست بهێنێت لەسالّی ١٩١٦ بڕیاردرا خەڵاتی نۆبڵ لە فیزیاو بە هاوبەشی بدرێتە ئەدیسۆن و تێسلا بەڵام هەریەکەیان رەتیان کردەوە خەڵاتەکە لەگەڵ ئەوی تردا وەربگرێت.

# داهێنانە دیارەکانی تێسلا کە لە ژیانی ئەمرۆدا بەکار دێن

١-تەزوی گۆڕاو " Alternating Current "

٢-دەست گرتن بە سەر ڕووناکی دا " Light "

٣-تیشکە ئێکس " X-Ray "

٤-ڕادیۆ و شەپۆلی ڕادیۆی " Radio "

٥-کۆنترۆڵ " Remote Control "

٦-ماتۆڕی کارەبای " Electric Motor "

٧-ڕۆبۆت " Robotics "

٨-لەیزەر " Lazer "

٩-پەیوەندیە بێ وایەرەکان " Wireless Communications "

١٠-ووزەی بێ وایەر " Wireless Energy "

**۱۱-ووزەی ئازاد و خۆڕای " Limitless Free Energy "**

**۱۲-سیستەمی گۆڕین و کەشوو هەوا " Haarp "**

**۱۳-مایکرۆوەیڤ " Microwave "**

**۱٤-تەلەفیزیۆن " TV "**

**۱٥-کۆیلی تێسلا " Tesla Coil "**

**ڕادار " Radar "**

**۱٦-مایکرۆسکۆپی ئەلیکترۆنی " Electric Microscop "**

**۱۷-گڵۆپی نیۆن " Neon Bulb "**

**۱۸-گڵۆپی فلۆرین " fluorescent bulb "**

**۱۹-لەرەلەر کەری تێسلا " Tesla oscillator "**

**۲۰-تیشکی مەرگ " Death Ray "**

## ٢١-کەمترایڵ " Chemtrail "

## ٢٢-بیرۆکەی سمارت فۆن " Smart phone "

### داهێنانە نادیارەکان

تێسلا لە نێوان هەموو مرۆڤەکانی پێش خۆی و سەدەی ئێستا و داهاتوو تاکە کەسە زۆرترین داهێنانی هەبوو بێ ، بۆیە ئەگەر سەیری مێژووی بکەین و سەیری ئێستا بکەین هەرگیز کەسێکی تری وەکو ئەو نادۆزینەوە ، ئەوە تەنها چەند داهێنانێی کەمی بوو هەرچەندە زیاتر لە ٧٥٠ دانەی تری هەیە بەڵام زۆرێکیان لە ساڵی ١٩٤٣ دوای مردنی تا ئێستا نازانرێ تەنها حوکمەتی ئەمریکا و دەزگاکانی CIA و FBI دەزانن وە هەروەها هەندێکیان هەرگیز ئاشکرای نەکردوە تەنها ئاماژەیەکی کەمی پێ داون .

## سروشتی ژیانی تێسلا

تێسلا جگە لە لایەنی زانستیەوە جێ ی
سەرسورمان بوو لایەکی تریشەوە بەهۆی
سروشتی ژیانی و هەندێ هەڵسوکەوتی تەواو
ناسرا بوو :-

لەگەڵ ژمارە ٣ دا پەیوەندیەکی سەیری
هەبوو بە جۆرێ ٣ جار دەستی ئەشۆرد یا ٣
جار بە دەوری باڵاخانەیەکدا ئەسوڕایەوە
پێش ئەوەی بچێتە ناوی لەوە ئەچێ تووشی
نەخۆشی واسواسی و دەروونی بوو بیت .

زۆر ڕقی لە مرواری بوو بە جۆرێ خەریك
ئەبوو شێت بێت کە ئەیبینی ، هەر ئافرەتێ
مرواری لە خۆی بەستبووبێ تێسلا قسەی

لەگەڵ نەكردوە وە نەشزانرا بۆ ئاوا رقی لێیەتی.

تێسلا ژیانی پڕ بووە لە مەینەتی و ئازار وە ژنیشی نەهێناوە ، ژیانی هاوسەرێتی بە هیچ جۆرێك بۆ ئەم رێك نەئەكەوت ، پێ ی وابوو ئەگەر زانایەك ژن بێنێ ئەوا داهێنانی گەورەی بۆ ناكرێت و ژن دەبێتە رێگر لە بەردەم كارەكانی !.

تێسلا ئەوەی وتبوو كە ئەنجام دانی سێكس دەبێتە هۆی لاواز بوونی بیری و تەركیز لە دەست دەدات بەمەش نایەوێ كار بكاتە سەر داهێنان و پرۆژەكانی.

هەموو كۆتای ژیانی لە نیو یۆرك بەسەر برد ، دوو ساڵی كۆتا لە هۆتێلی New Yorker

له ژوورەكانی ژمارە ٣٣٢٧ كە دەكەوتنە قاتی سێیەم .

لەگەڵ ئەوەی تێسلا خاوەنی ئەو هەموو داهێنان و پرۆژانە بوو بەڵام وەكو كەسێكی هەژار و بێ كەس دەژیا ئەتوانین بڵێین موفلیس بوو بوو تێسلا كۆتر باز بوو زۆر حەزی بە كۆتر ئەكرد نەك تەنها خواردنیان باتێ وبەخێویان كات بەڵكو كۆتری نەخۆش و بریندارى هەڵگرت لەگەڵ خۆی و ئەی برد بۆ ژوورەكەی بۆ ئەوەی چارەسەریان بكات ، وەكو دەلێن كۆترێك دڵی تێسلای بردوە ! تێسلا لەسەر كۆترێك هەندێ كتێبی نووسیوە نازانرێت بۆ .

تێسلا باوەری تەواوی بە زانستی باشكردنی وەچەنانەوە هەبوو وە دەی وت هەندێ مرۆڤ بۆ ئەوە ناشێن وەچە بنێنەوە و مناڵیان بێت ! چونكە ئەو كەسانە نازانن بژین و

ناتوانن سود بگەیەنن ، ئەویش لە رۆژنامەی Smithsonian بڵاو بوویەوە لە ساڵی ١٩٣٥ کە خۆی نووسی بووی.

## کۆتاییەکی ناخۆش

گومانی تێدا نیە تێسلا یەکێ بووە لە زیرەك ترین و خەیاڵی ترین مرۆڤ کە لەسەر زەوی رۆشتووە ، لەسەر چەند سایتێکی فەرمی ئەم پڕوپاگەندە نوسراوە باس لە مردنی تێسلا دەکات :

کە بە تەنها مردوە لە ژوورەکەی خۆی دا ژووری ژمارەی ٣٣٢٧ لە هوتێلێکی نیو یۆرك سیتی ئەویش ژنێك پێ ی زانی دوای ئەوەی چوویە ژوورەکەی لەسەر دەرگای ژورەکەشی نوسرا بوو do not disturb واتە ئیزعاجم مەکە کە ٢ رۆژ پێش مردنی ئەو نوسینەی دانا بوو ، دوای لێکۆڵینەوە

دەرکەوت کە بەهۆی گیرانی دەمارە
خوێنبەرەکانی دڵی و ئەویش جەلتە لێی دا
بوو بە ، هەر دوو رۆژ دوای ئەوە **FBI** ی
ژوورەکەی تێسلایان گرت و هەرچی زانیاری
و نوسراوی تێسلا هەبوو بردیان **!!!** بۆ ؟
چونکە **FBI** و **CIA** دژی تێسلا بوو هەر
گومان لەوان هەبوو چەند سالێك پێشتوو تر
کاتێ تێسلا گەنج بوو تاقیگەکەیان سوتاند
راستە تێسلا دانیشتووی ئەمریکا بوو بەڵام
ئەوان چارەیان نەویست دەزانن ، چونکە
تێسلا داهێنانەکانی بواری جەنگی نە ئەدایە
دەستی ئەڵمانیاو ئەمریکا وە ویستی ووزەی
کارەبا بکات بە خۆرای وا بکا کارەبا پارەی پێ
نەدرێ ، دەسەڵات داران ئەمەیان نەویست
بۆیە خەوەکەی تێسلا نەهاتە دی ..راستی
تێسلا بەو شێوە نەکوژرا بەڵکو خنکێنرا ،
ئۆتو سکۆرزنی **otto skorzeny "**
**١٩٠٨ ـ ١٩٧٥ "** کە زابتێکی دەزگای

**هەواڵگری و کردوە تایبەتەکان بوو لە هێزە یەکگرتوەکانی نازی SS ی ئەڵمانی لە جەنگی جیهانی دووەم دا تێسلای خنکاند لە (٧)کانوونی دووەمی 1943لە تەمەنی (٨٦) ساڵیدا.**

**لە ئیعتیراف و بەڵگەکانی سکۆرزنی لە زمانی خۆیەوە :**

**من و گیڵن فێڵمان لە تێسلا کرد و هەڵمان خەڵەتاند چەند رۆژێ پێشوو تر بۆ ئەوەی وای لێ بکەین زانیاری لێ دەرکەین لەسەر گرنگترین دۆزینەوەکانی ، دوای کوشتنی ، هەموو نوسرا و شتەکانی تێسلامان دزی کە لە قاسەی ژوورەکەی دا بوو پاشان نوسرا و دۆزینەوە و شتەکانی نێردران بۆ هیتلەر ، بەڵام دواتر سوپای ئەمریکا توانی نوسرا و دۆزینەوە و تازە گەریە گەوهەرەکانی تێسلا بگێرێتەوە ئەویش لە رێگەی تۆرێکی نهێنی هەواڵگری لە لە کۆتای جەنگی جیهانی**

دووەم. ئەم ڤیدیۆش هەندێ زانیاری نهێنی و باشی تێدایە.

## (تۆماس ئەدیسۆن)

تۆماس ئالڤا ئەدیسۆن (لەدایکبووی ١١ی شوباتی ١٨٤٧ داهێنەر و شارەزا و بازرگانی ئەمریکی بوو کە کۆمەڵێک ئامێری بەسوودی داهێنا کە کاریگەریی زۆریان هەبوو لەسەر ژیانی سەرزەوی، وەکوو گرامافۆن، کامێرای وێنەهەڵگرتن و گڵۆپێک ئەلەکتریکی بە مانەوەی درێژخایەن. لە یەکەمین داهێنەرانێک بوو کەوا شێوی کۆسازکردن و هاوکاریکردنی گرووپ بۆ داهێنانی بەکارهێنا.

ئێدیسن وەک داهێنەرێکی پڕکار و بەبەهرە ناسراوە، تەنها لە وڵاتی ئەمریکا (١،٠٩٣) داهێنانی تۆمارکردووە، هەروا کۆمەڵێکی تریش لە بەڕیتانیا، فەڕەنسا و ئەڵمانیا. هەندێ لە داهێنراوەکانی کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر پەیوەندی و دوابەدوای ئەوە لەسەر پەیوەندی دوورەوە.

## دەستپێکی کاری ئەدیسۆن

لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا دەستی کرد بە ڕێکخستن و ئەنجامدانی ئەو شتانەی خوێندوونی و خستنە کاریان. دایک و باوکی قایل کرد بەوەی ڕۆژنامە بفرۆشێت بەو ڕێبوارانەی لە هێڵی شەمەندەفەری گراند ترەنک رەیلڕۆددا بوون. لە دوای ئەوە تۆماس دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە بچووکەکەی خۆی بەناوی گراند ترەنک هێراڵد. لە کاتێکدا لە هێڵی شەمەندەفەر کاری دەکرد، منداڵێکی سێ ساڵانی لەوە ڕزگار کرد

کە ببێ بەژێر شەمەندەفەرەوە، باوکی منداڵەکە سوپاسی کرد و بەوە پاداشتی دایەوە کە فێری تەلەگراف - برووسکە-ی کرد. لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا، بە تەواوی فێری خستنەکاری ئامێری تەلەگراف بوو. لە ساڵی ١٨٦٦ و لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا، ئەدیسۆن ڕۆیشت بۆ شاری لویسڤایڵ و لەوێ بۆ ئاژانسی ئەسۆشییەیتد پرێس دەستی کرد بە کار. شیفتی شەوانی ڕۆژنامەکە ڕێگەیان پێدا شەوانە لەوێ بمێنێتەوە، بخوێنێتەوە و ئیشی خۆی بکات. لە ساڵی ١٨٦٨دا گەڕایەوە ماڵەوە و بینی دایکی تووشی نەخۆشی عەقڵی بووە و باوکیشی بێئیش و بێ کارە. بۆیە داوای لە هاوڕێیەکی کرد کاری بۆ بدۆزێتەوە و دواتر لە 'وێسترن یونیۆن' دەستی بە کار کرد لە بواری تۆمارکردنی دەنگدا.

## بوون بە داهێنەر

لە ساڵی ١٨٦٩، ئەدیسۆن ڕۆیشت بۆ شاری نیویۆرک و گەشەی بە یەکەمین داهێنانی خۆی دا، کە ئەویش تیکەر و نووسین بوو لەسەر دوکانێکی شتومەک، ئەو کاتە ئەدیسۆن تەنیا تەمەنی ٢٢ ساڵ بوو و بۆ ئەمەیش بڕی ٤٠ هەزار دۆلاری وەرگرت. لە ساڵی ١٨٧٠ ئەدیسۆن یەکەم تاقیگەی بچووکی خۆیی دانا و چەندین کارمەندی میکانیکی دامەزراند. لە ساڵی ١٨٧١یشدا کچێکی تەمەن ١٦ ساڵانی بە ناوی ماری ستیلوێڵ کردە هاوسەری خۆی، کە لە شوێنی کارەکەی ئەدیسۆن کارمەند بوو. لە ماوەی ١٣ ساڵی هاوسەرگیرییاندا سێ منداڵیان بوو بە ناوەکانی؛ ماریۆن، تۆماس و ویلیام. ویلیام دواتر بووە داهێنەر. ماری، هاوسەری ئەدیسۆن، لە تەمەنی ٢٩ ساڵی و لە ساڵی ١٨٨٤دا بەهۆی بوونی لوو لە مێشکیدا کۆچی دوایی کرد. پاش مردنی ژنەکەی بە

دوو ساڵ، ئەدیسۆن ژنی دووەم دێنێتەوە کە ١٩ ساڵ لە خۆی منداڵتر بووە و ناوی مینا میلەر بوو. لە سەرەتاکانی ١٨٧٠دا ئەدیسۆن ناوبانگی وەک یەکەم داهێنەری جیهان بڵاو بوویەوە. لە ساڵی ١٨٧٦ کۆمپانیای وێسترن یونیەن هانی ئەدیسۆنی دا کە ئامێری پەیوەندیکردن گەشە پێبدات بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئامێری تەلەفۆن کە گراهام بێڵ دایهێنابوو. بەڵام ئەدیسۆن ئەو داوایەی هەرگیز جێبەجێ نەکرد. بەهەرحاڵ لە کانونی یەکەمی ١٨٧٧دا ئەدیسۆن گەشەی بە ڕێگەیەک دا بۆ تۆمارکردنی دەنگ؛ فۆنۆگراف. لە ساڵی ١٨٨٧دا ئەدیسۆن لە شاری وێست ئۆرەنجی ویلایەتی نیوجێرسی تاقیگەیەکی توێژینەوەی پیشەسازی دامەزراند و زۆربەی کاتەکانی لەوێ بەسەر دەبرد و سەرپەرشتیاریی گەشەی تەکنەلۆجیای گڵۆپ و ڕووناکی و سیستمی

وزە دەکرد. هەروەها فۆنۆگرافەکەشی کامڵ کرد و گەشەی بە کامێرای وێنەی جوڵاو و باتری دا.

## ساڵانی کۆتایی ژیانی ئەدیسۆن

تۆماس ئەدیسۆن بەهۆی نەخۆشیی شەکرەوە لە ١٨ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣١دا کۆچی دوایی کرد لە ماڵەکەی خۆی لە گلێنمۆنت، وێسترن ئۆرەنج، لە ویلایەتی نیو جێرسی. ئەو کاتەی مرد تەمەنی ٨٤ ساڵ بوو. لە جیهاندا زۆربەی جڤات و دامەزراوەکان گڵۆپ و وزە ئەلیکتریکییەکانیان کوژاندەوە وەک بەشداریکردن لە هاوخەمی مردنەکەیدا. ئەدیسۆن لە ژیانی خۆیدا کابرایەکی کۆمەڵایەتی نەبووە و هەندێجاریش خێزانەکەی ڕەت دەکردەوە. بەڵام ئەو کاتەی کە مرد ئەو یەکێک بوو لە ئەمەریکییە بەناوبانگ و ڕێزلێنراوەکانی جیهان. هەروەها

# ئەدیسۆن بە یەکێک لە پێشڕەوانی بواری بازرگانی لە ئەمەریکا دادەنرێت.

## (ئەلێکساندەر گراهام بێل)

ئەلیکسەندەر گراهام بیل، لە (٣ی ئایاری ١٨٤٧) لە شاری ئەدنبرە لە ئێرلەندا لە

دایکبووەو لە (٢ی ئابی ١٩٢٢) لە شاری
نۆڤا سکوشیا لە کەنەدا کۆچی دوایی کردووە،
یەکێک بووە لە زانا ناودارەکانی جیهان لە
بواری دەنگدا، داهێنەر و ئەندازیار بووە،
خاوەنی دروستکردن و داهێنانی
تەلەفۆن_یشە. هەریەک لە باوکی و باپیرەو
برایەکی لە بواری وتووێژکردنو
راستکردنەوەی وتنی وشەکانو قسەکردنو
فێرکردنی کەروولاڵەکان، کاریان کردووە.
هاوسەرەکەی و دایکیشی، کەروولاڵ بوون،
ئەمەش کاریگەری خستە سەر ژیانو کاری
گراهام بیل. لەسەرووی ئەوەش، کارکردنو
گەڕانی لە بواری بیستنو قسەکردن پاڵی
پێوەنا بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی زیاتر
لەسەر ئامێرەکانی بیستن، ئەمەش وایکرد، لە
کۆتاییدا ئامێری تەلەفۆن دابهێنێتو یەکەم
داهێنانی تۆمارکراو لە ویلایەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەساڵی ١٨٧٦،
بەدەست بهێنێت.

بەڵام ئەوەی سەیر بووە لە ژیانی کارکردنی داهێنەری تەلەفۆن، ڕەتکردنەوەی دانانی ئەو ئامێرە بووە لە نووسینگە تایبەتەکەی خۆی، چونکە پێیوابووە دەستوەردان دروست دەکات لە کارەکانی.

کێشمەکێش لەسەر داهێنانەکە هەرچەندە ساڵانێکە واباس دەکرێت، کە ئەسکەندەر گراهام بیل، داهێنەری ئامێری تەلەفۆنە، بەڵام بەم دواییانەو لە سەدەی ٢١، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەسمی، ئەو داهێنانەی لە گراهام بیل وەرگرتەوەو بەخشییە "ئەنتۆنیو میوچی"، کە لە بنەڕەتدا خەڵکی ئیتاڵیا بووەو دواتر ڕوویکردووەتە شاری "هاڤانا"ی کوبا، پاشان خۆی

گەیاندووەتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

کۆنگرێسی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠٠٢ بە رەسمی دانی بەوەدا نا، کە "ئەنتۆنیو میوچی" داهێنەری راستەقینەی ئامێری تەلەفۆنە، ئەمەش دوای (١١٣) ساڵ لە مردنی میوچی لە ساڵی ١٨٨٩ی زاینی. لە ساڵی ١٨٥٤، هاوسەرەکەی "میوچی" تووشی نەخۆشی رۆماتیزم دەبێت، بەو هۆیەشەوە لەسەر جێگا دەکەوێت، بۆیە میوچی هەستا بەدروستکردنی ئامێرێکی بچووک بۆ پەیوەندیکردن لە نێوان خۆی و هاوسەرەکەی کاتێک لە ژووری تاقیگەکەیدا کاری دەکرد، ئەمەش وەکو سەرەتای دروستکردنی ئامێری تەلەفۆن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دادەنرێت، کە بە ٢٠ ساڵ پێش داهێنانەکەی گراهام بیل دەکەوێت.

میوچی، داوایەک بۆ تۆمارکردنی داهێنانەکەی لە ساڵی ١٨٧١ لە نیویۆرک بەرز دەکاتەوە، بەڵام نەیتوانی داواکەی تۆمار بکات، چونکە ئەو (١٠) دۆلارەی نەبووە، کە پێویست بووە بۆ پێشکەشکردنی داواکەی بیدات، ئەمەش وەک لە مێژووی رەسمی ئیتاڵیا، تۆمارکراوە.
دوای لە دەستدانی هیواکانیو بەهۆی برینداربوونی لە تەقینەوەی پاپۆڕێکدا، هاوسەرەکەی هەڵدەستێت بە فرۆشتنی زۆربەی ناوماڵو داهێنانەکانی میوچی بە بازرگانێک، لە نێویشیاندا ئامێرە بچووکەکەی پەیوەندیکردنی نێوان هەردووکیان.

دوای چاکبوونەوەی، میوچی دەچێتە لای بازرگانەکە بۆ کڕینەوەی داهێنانەکانی، بەڵام بازرگانەکە پێیڕادەگەیەنێت، کە ئامێرە بچووکەکەی فرۆشتووە بە گەنجێکو نایناسێتەوە، زۆربەی خەڵک لەو سەردەمەدا،

باسیان لەوەدەکرد ئەو گەنجە یەکێک بووە لە پیاوەکانی "ئەلیکسەندەر گراهام بیل"، بەڵام تائێستاش بەڵگەی دروست لەسەر ئەو تۆمەتانە نییە.

کێشمەکێشی نێوان داهێنەری راستەقینەی تەلەفۆن، تائێستاش ماوە، ئەمریکییەکان بە رەسمی ئەنتۆنیو میوچی بە داهێنەری تلیفۆن دادەنێن، بەڵام وڵاتانی دیکە، "ئەلیکسەندەر گراهام بیل" بەخاوەنی داهێنانی تەلەفۆن دەزانن، لە نێو ئەو وڵاتانەشدا، بەریتانیاو کەنەدا بە رەسمی ئەوەیان راگەیاند، تەنانەت پەرلەمانی کەنەدا، دانیشتنێکی بەپەلەیان بۆ ئەو مەبەستە ئەنجامداو دواتر بە رەسمی رایگەیاند، گراهام بیل داهێنەری تەلەفۆنە، کاردانەوەی پەرلەمانی کەنەدا لەوەوە سەرچاوەی گرت، کە داهێنەرەکەی تەلەفۆن ساڵانێکی زۆر لەو وڵاتە ژیاوە.

**لە زۆربەی پەیوەندییەکاندا، وشەی (ئەلو) وەک سەرەتایەک بەکاردەهێنرێت، ناوبەناو لە درێژەی پەیوەندییەکانیشدا دەوترێتەوە، بەڵام لە بنەڕەتدا، وشەکە (Hello) (هێلۆ)یە، نەک (ئەلو).**

**هیلو، ناوی کچێکە، ئەو کچەش "مارگریت هیلو"ە، کە خۆشەویستی داهێنەری ئامێری تەلەفۆنە، داهێنەرەکە (ئەلیکساندەر گراهام بیل) بۆ یەکەمجار کە ئامێرەکەی تاقیکردەوە، لەگەڵ خۆشەویستەکەی قسەی کرد، وتی: "هیلو".**

**ئەو وشەیە بە تێپەڕبوونی کات، بوو بە (ئەلو)، زۆربەمان ناوی داهێنەری تەلەفۆن نازانین، یان لە بیرمان کردووە، بەڵام تائێستاش ناوی خۆشەویستەکەیمان لەسەر زارە...**

# (سیگمۆند فرۆید)

**سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦ - ١٩٣٩)**
**پزیشکێکی دەرونزانی نەمساوییە،**
**دامەزرێنەری پەیڕەوی دەرونشیکارییە،**
**فرۆید یەکێکەلە گەڕیدە هەرەمەزنەکان، لە**
**مێژوی مرۆڤـایەتیدا چەندان ناوچەی**
**نەزانراوی ئاشکراکردوە، ئەو ناوچانەش**
**پێش ئەو کەس پەی پێ نەبردوون، بەڵام**
**جیاوازی ئەم لەگەڵ گەڕیدەکانی تردا ئەوەیە،**
**ئەم ئەمریکای خۆی لە ناخی مرۆڤدا**
**دۆزیەوە، نەک لە جوگرافیای دەرەکیدا،**
**ئەویش مەبەستمان جیهانی نەستە، کە وەکو**
**مۆزەخانەیەک بەشی هەرە زۆری یادەوەری**
**و هەستە سەرکوتکراو و چەپێنراوەکانی**

ژیانی ڕۆژانەمان لەوێدا پاشەکەوت دەکرێت و لەکاتی پێویستدا سەر هەڵدەدەنەوەو، دێنە پێشەوە، بەڵام ئەو کاتە پێویستانە چ کاتێکن؟
فرۆید دەڵێ لەکاتی شۆک
وڕوداوە ناخۆشەکان و جیهانی خەون و هەندێ لە نەخۆشیەکاندا دێنەوە پێشەوە.
گرنگی دۆزینەوەکانی فرۆید لەوەدایە کەهەمیشە بەدوای ئەو پرسیارەدا دەگەڕێت: بۆچی خەڵک بەم شێوەیە ڕەفتار دەکەن کە پێی ڕاهاتون؟؟!

فرۆید لە مایسی (١٨٥٦) لە خێزانێکی جولەکەی دەستکورتدا لە دایک بووە، پاشان خێزانەکەی لە دەستی هەڵمەتی هۆلۆکۆست (دژەسامیەت) هەڵهاتون چون بۆ شاری (لێپزینگ)، پاشان دوای ماوەیەکی کەم لە ڤییەننا جێگیربوون و فرۆیدی تەمەن چوار ساڵە بەشی زۆری تەمەنی خۆی لەو شارەدا بەسەر دەبات، ساڵی (١٩٣٨)، نازییەکان

نەمسا داگیر دەکەن و لەسەر ئەوەی جولەکەیە، زۆری بۆ دەهێنن، ئەویش بە خۆیی و خێزانەکەیەوە ڕودەکاتە لەندەن و هەر لەوێش دەمرێت.

## شۆڕشی فرۆید لە کەسایەتی مرۆڤدا

ئەم ڕاپورتە هەوڵدانێکە بۆ تێگەیشتن لە تیۆرە شۆڕشگێرێکەی فرۆید (سایکۆلۆژیایی شیکاری)، بەمەبەستی ئەوەی ئایا سایکۆلۆژیای شیکاری ئایدیایەکی مەزنە لە بواری کەسایەتیدا یاخود نا؟ هەروەها بنەما بنەڕەتییەکانی ئەم تیۆرە لێرەدا باسکراون، لەگەڵ باسکردنی بۆ چوونی شارەزایان لەم بوارەدا، هەروەها گەلێک ڕەخنە ئاڕاستەی تیۆرەکە کراون، باسکراون لەگەڵ لایەنە بەهێزو تۆکمەکانی تیۆرەکە.

ئەوەی پێویستە باسبکرێت، ئەوەیە کە سایکۆلۆژیای شیکاری میتۆدێکە بۆ تێگەیشتن لە کارە عەقڵیەکان و قۆناغەکانی گەشەکردن و بەرەو پێشچونیان، سایکۆلۆژیای شیکاری هەوڵ ئەدات بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی ئاڵۆزی نێوان عەقڵ و جەستەی مرۆڤ، تێگەیشتن لە ڕۆڵی هەست و سۆزەکان لەگەڵ ئەمانەشدا سایکۆلۆژیای شیکاری بناغەی گەلێک چارەسەری ترە.

-ئەوەی فرۆید کردی وەک شۆڕشێک وابوو لەکاتی خۆیدا، تەنانەت ئێستاش بەشێوەیەکی بەرفراوان قابیلی قبوڵکردنە لەلایەن زۆربەی قوتابخانە دەرونیەکانەوە.

-ساڵی (١٨٩٦) فرۆید زاراوەی (سایکۆلۆژیای شیکاری) داهێنا، لەماوەی (٤٠) چل ساڵی دوایشدا هەموو هەوڵی خۆی خستەگەڕ بۆ گەشە پێدانی (بنەماکانی،

**ئامانجەکانی، تەکنیکەکانی، ڕێگەکانی چارەسەری سایکۆلۆژیای شیکاری).**

**-زۆربەی نوسینەکانی فرۆید و بیرکردنەوەکانی تایبەتە بە ژیانی عەقڵ (MENTAL LIFE) و ڕاڤەکردنی خەون و تەکنیکی سایکۆلۆژیای شیکارکردن لەگەڵ هەندێ بابەتی تردا.**

**-سایکۆلۆژیای شیکاری بەردەوام بووە لە گەشەکردن و لە ساڵی ١٩٢٥ گەیشتە لوتکەو ترۆپکی گەشەکردن و بووە بەربڵاوترین بزوتنەوەی جیهانی و فرۆیدیش بووە کەسێکی ڕادیکاڵی بەهۆی کارەکانیەوە بەماوەیەکی زۆر کەم بووە ناودارتین ڕابەری سایکۆلۆژیای شیکاری، وە پاش مەرگیشی فرۆید کەلەپورێکی بێهاوتای بۆ بەجێهێشتوین کەتا ئێستاش کاریگەری بەردەوامی خۆی هەیە.**

بۆیە فرۆید پێی وایە سایکۆلۆژیای شیکاری کاریگەرترین میتۆدە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەبارەی عەقڵی مرۆڤەوە... وە لەڕێگەی سایکۆلۆژیای شیکارکردنەوەیە، کە نەخۆش ئەتوانێت خۆی ئازاد بکات لە ئاڵۆزیە عەقڵیەکان و ڕێگەی تریش بگرێتە بەر بۆ تێگەیشتن لە خودو ئەوانیتر..

# (گابرییێل گارسیا مارکێز)

**گابریل گارسییا مارکێز( له ٦ی ئازاری ١٩٢٧ لەدایکبووە– ١٧لەی نیسانی ٢٠١٤کۆچی دوایی کرد) نووسەرێکی بەناوبانگەی خەڵکی کۆلۆمبیا و براوەی خەڵاتی نۆبێلی وێژە بووە.**

**گابرییێل گارسیا مارکێز ڕۆمانووس و ڕۆژنامەوان و بڵاوکەر و سیاسەتمەدارێکی وڵاتی کۆلۆمبیا بوو. له ڕێکەوتی ٦ی ئازاری ١٩٢٨ له گوندی ئارکاتاکای ناوچەی سانتامارای کۆلۆمبیا لەدایک بوو. خێزانی گارسیا بەهۆی هەژاری و نەداری ئەرکی بەخێوکردن و گەورەکردنی گارسیای منداڵ بەباوەگەورەی دەستپێرن.**

ئەو ماوەی لەلای باپیری بوو گابرێلی منداڵ هەموو ڕۆژێک بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک گوێی لەحیکایەت و چیرۆکەکانی باوەگەورەی دەگرێ و ئەو بابەتە هێندە کاریگەری لەسەر گابریێل دادەنێ کەناوبراو دواتر دەنووسێ هەست دەکەم سەرجەمی نووسراوەکانم دەربارەی ئەزموونەکانم لەباوەگەورەو رابردووەکانی باوو باپیرانمەوەیە.

دواتر گابریێل لە هەشتساڵیدا باوەگەورەی لەدەست دەدات و دایە گەورەشی بەهۆی پیری و پەککەوتوویی چاوی لەدەست دەدات و کوێر دەبێ. هەر بۆیە گابرابرێلی مێرمنداڵ بۆ جارێکیتر بۆ لای خێزانەکەی دەگەڕێتەوەو بەشێوەی فەرمی دەست بەخوێندن لەقووتابخانەکان دەکات. گابریێل لەخوێندنگە سەرەتاییەکەی شاری "سوکری" بەنووسینی شیعرو کێشانی کاریکاتێر ناوبانگ دەردەکات

و بەهۆی بێدەنگبوون و سەرقاڵبوون بەکارەکانی لەقووتابخانە بە «گابرێلی پیرە پیاو» دەناسرێ.

ساڵی ١٩٤٠ و لەتەمەنی ١٢ ساڵیدا بورسی خوێندن بۆ خوێندکارانی زیرەک وەردەگرێ روو لەقووتابخانەیەکی سەر بەکەنیسە لەشاری زیپاکیورای نزیک پایتەختی کۆلۆمبیا دەکا. پاش هەفتەیەک مانەوە لەقووتابخانەکە واز لەخوێندن دێنێ و بۆماڵەوە دەگەڕێتەوە.

دواتر گابرێلی گەنج دەست بەنووسین دەکات و یەکەم نووسراوەکانی لەساڵی ١٩٤١ و لە رۆژنامەی «جوین تودەیی» تایبەت بە خوێندکارانی کۆلۆمبیا بڵاودەکاتەوەو لەساڵی ١٩٤٧ بۆ درێژەدانی خوێندن روو لەزانکۆی

بۆگۆتا دەکات و دەست بەخوێندنی یاسا دەکات.

گابرییێل هاوشێوەی زۆربەی نووسەرانی گەورەی جیهان پێیوایە کەزانکۆ هیچ چێژو خۆشییەکی زانستی پێ نابەخشێ و هەربۆیە بەجێگەی سەعیکردن و خوێندنی کتێبەکانی زانکۆ روو لەخوێندنەوەی شیعرو گەڕانی بێ ئەنجام بەناو شەقامەکانی شاردا دەکات.

گابرییێل گارسیا مارکیز لەساڵی ١٩٤٦ بەشێوەی جدی دەست بەنووسین دەکات و یەکەم چیرۆکی بەناوی سێهەمین دەست لە کارکێشانەوە لەرۆژنامەی ئال بۆگاتا بڵاودەکرێتەوە. پاش بڵاوبوونەوەی کورتە چیرۆکەکە، چەندین چیرۆکیتر دەنووسێ و لەهەمان رۆژنامەدا بڵاوی دەکاتەوە.

دواتر ساڵی ١٩٦٥ دەست بەنووسینی ڕۆمانی سەد ساڵ لە تەنیایی دەکات و لەساڵی ١٩٦٨ نووسینی چیرۆکەکە تەواو دەبێ. ڕۆمانێک کەبووە شاکاری ئەدەب و تائێستاش بە گرنگترین ڕۆمانی جیهان ناودێردەکرێ.

## خەڵاتی نۆبێل

ساڵی ١٩٨٢ لێژنەی هەڵبژاردنی خەڵاتی نۆبێلی ئەدەبیات لە وڵاتی سوید بەتێکڕایی دەنگ ڕۆمانی سەد ساڵ لە تەنیایی بەباشترین بەرهەم هەڵدەبژێرن و خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب بەگابرییێل دەبەخشن. "سەد ساڵ تەنیایی" بە خێرایی هەموو سنوورەکانی جیهان دەبڕی و وەردەگێڕدرێتە سەر زۆربەی زمانەکانی جیهان.

نووسەری ڕۆمانی بەناوبانگی جیهانی سەد ساڵ لە تەنیایی لەتەمەنی ٨٧ ساڵیدا لە ١٧ی نیسانی ٢٠١٤ گیانی لەدەست دا.

## (وینستۆن چێرچیل)

وینستۆن لیونارد سپێنسر چێرچیل،
(لەدایکبووی ٣٠ی تشرینی دووەمی ١٨٧٤
- مردن ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٦٥)
ڕامیاریزان و دەسەڵاتدارێکی بەڕیتانی بوو کە
بەهۆی ڕێبەرایەتی بەڕیتانیا لە درێژەی
شەڕی جیهانی دووەمدا ناسراوە، هەروا
لەدونیادا بە گشتی وەک یەکێک لە ناودارترین
ڕابەرەکانی سەردەمانی شەڕ ناسراوە. وەک
سەرۆک وەزیران دووجار خزمەتی وڵاتی
کردووە لە نێوان ١٩٤٠ تاکوو ١٩٤٥ و

**دواتر لە ١٩٥١ تاکوو ١٩٥٥. چێرچیل هەروەها ئەفسەری ئەرتەشی بەریتانیا، مێژووزان، نووسەر و هونەرمەند بووە. تا ئەمڕۆ تەنها سەرۆک وەزیرێکی بەریتانیا بووە کە خەڵاتی نۆبێلی وێژەی وەرگرتووە و یەکەم کەسە کە هاووڵاتی شانازیی ئەمەریکای وەرگرتووە.**

**لە کاتی خزمەتی لە سوپای بەریتانیادا، دەوری هەبووە لە هیندستان، سوودان و "شەڕی دووەمی بوئێر". وەک هەواڵنێرێکی کاتی شەر لە ڕێگەی نووسینی کتێبێک هاوکات لەگەڵ شەڕەکاندا، بە ناوداری گەیشت. هەروەها لە شەڕی جیهانی یەکەمدا بە کورتی لە سوپای بەریتانیادا لە شەڕگەی ڕۆژاوادا فەرماندەی گوردانی شەشەمی چەکدارەکانی ئەرتەشی سەڵتەنەتی سکۆتلاند بوو.**

**چێرچیل بۆ ماوەی پەنجاساڵ لە ڕیزی پێشەوەی کاروباری ڕامیاریی بەریتانیا بووە و بەچەن جار خاوەنی ڕۆڵی گرینگ وەک ئەندامی ئەنجومەنی وەزیران بووە. پێش شەڕی یەکەمی جیهانی سەرۆکی وەزارەتی ئابووری و بازرگانی، وەزیری ناوخۆ و وەک کەسی یەکەمی هێزە دەریاییەکانی دەوڵەتی لیبەڕاڵ خزمەتی کردووە. لە کاتی شەڕدا تا "ڕووداوی گالیپۆلی" وەک کەسی یەکەمی هێزە دەریاییەکان ماوە و دوای ئەوە لە دەوڵەت ڕۆشتە دەرەوە. وەک وەزیری تەقەمەنی گەڕایەوە بۆ ناو دەوڵەت و پۆستی وەزیری کاروباری دەرەوە بەشی شەڕ و ئاسمانی وەرگرت. لە ماوی دوو شەڕی جیهانیدا وەک بەڕێوبەری خەزێنەی دەوڵەتی خۆڕاگر خزمەتی کرد.**

دوای دەستپێکردنی شەڕی جیهانی دووەم، دیسانەوە بووەوە بە یەکەم کەسی هێزی دەریایی، بەڵام دوای دەست لەکارکێشانەوەی نۆڤیل چەمبرلین لە ١٠ی ئایاری ساڵی ١٩٤٠ بوو بە سەرۆک وەزیرانی بەڕیتانیا و وڵاتەکەی بۆ سەرکەوتن بەسەر تەوەرەی هێزدا ڕابەرایەتی کرد. وتەکانی چێرچیل هەمووکات سەرەنجی هەموانی ڕادەکێشا بۆیە بوو بە ئیلهامدەری جەماور و هەروا وڵاتانی هاوپەیمان.

دوای ئەوە حیزبی خۆڕاگر هەڵبژاردنەکانی ١٩٤٥ی لەکیسچوو، بوو بە ڕابەری رەخنەگرانی دەوڵەت. لە ١٩٥١ دیسانەوە بوو بە سەرۆک وەزیران پێش ئەوەی لە ١٩٥٥ بۆ هەمیشە دەست لەکار بکێشێت. دوای مردنی، شاژنی بەڕیتانیا میداڵی شانازی وڵاتی پێداو یەکێ لە گەورەترین ڕێوڕەسمەکان بۆ ناشتنی جێبەجێ کرا.

# (چارڵی چاپلن)

چارلز ئێسپێنسێر چاپلین (لە دایکبووی ساڵی١٨٨٩-مردنی ساڵی ١٩٧٧) بەناوبانگ بە چارلی چاپلین. ئەکتەرێکی کۆمیدی و دەرهێنەر و ئاوازدانەرێکی ئینگلیزە ، کە بە زۆری ناوبانگی بەهۆی فیلمە بێدەنگەکانیەوە دەرکرد.[ پێش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم بەناوبانگترین ئەستێرەی جیهانی بوو لە فیلمدا.

چارڵی چاپلن لە ١٦ ئاپریلی ١٨٨٩ لە وال وێرتی لەندەن لە بنەماڵەییێکی جولەکە لە دایک بوو. باوکی چارلز و دایکی هاناهیل هەر دووکیان لە جیهانی مۆسیقا کاریان ئەکرد. هێشتا ماوەییێکی زۆر لە لەدایک بوونی چارلی تێپەڕ نەبووکە چارلز و هانا لە یەک جیا بوونەوە و هانا سەرپەرشتی منداڵەکانی لە ئەستۆ گرت. ئەوان ژیانێکی دژواریان تێ ئەپەڕاند لە بەر ئەوەی دایکی نەیتوانی بە ئاسانی بژیوی ژیانیان دابین بکات . لەبەر ئەمە چارلی بچکۆلانەو و برای گەورەتری سیدنی بۆ کار کردن، ماڵیان بەجێ هێشت و لە ڕیکخراوەییێکی هونەری بەرهەم هێنانی فیلم وەک پادو دامەزران. هەڵبەت نەیانتوانی لەوێ بەردەوام بن. کاتێ چارلی ١٢ ساڵان بوو باوکی کە پیاوێکی هەمیشە سەرمەست بوو، کۆچی دوایی کرد. چارلی دایکێکی سەلامەتیشی نەبوو. دایکی چارلیش

تووشی نەخۆشینی ڕەوانی بوو و لە ناکاو لە نەخۆشخانەی ڕەوانی «کین هیل» لە ساڵی ١٩٢٨ کۆچی دوایی کرد.

چارلی لە ساڵی ١٩٠٦ کاتێ کە ١٧ ساڵ تەمەنی بوو، لە شانۆی «شارلۆک هۆڵمز» لە ڕۆڵی کوڕی ڕۆژنامە نووسێکا باش دەرکەوت و ئەو لە لایەن دەرهێنەر گەشەی پێدراو وڕەزامەندی تەماشاچیەکانی بە دەس هێنا. لەمە بە دواوە لە گرووپێکی کۆمێدی بوو بە ئەندام و ڕۆڵی تەڵخەکی لە گرووپی شانۆی «فڕێد کاڕنو» بە خۆی دابین کرد .ساڵانی دوایی ئەو بە ئاواتی خۆی گەیشت و توانی لە گەڵ کۆمپانی «یونایتێد ئارتیست» لە هالیوود گرێبەست ببەسێ. ئەو لە گەڵ لیتا ئەکتەری هۆلیوود ژیانی هاوسەری پێک هێنا و بوو بە خاوەنی دوو منداڵ بەڵام دوای ماوەیێک لە یەکتر جیا

بوونەوە. لەساڵی ١٩٢٧ بە دواوە،
فیلمگەلێکی بێ دەنگی بەرهەم هێنا. لە
ڕاستی دا فیلمە کۆمێدییەکانی ئەو بێ دەنگ
بوون بەڵام چارلی وەها بە تواناداروونیەکانی
خۆی و خۆشەویستی ڕۆڵی ئەبینی کە هەموو
جوڵەکانی هەزاران مانای لەخۆ دەگرت.

چارلی چاپلین لە ساڵی ١٩٤٠ یەکەمین فیلمی
بەدەنگی خۆی بە ناوی دیکتاتۆری گەورە
بەرهەم هێنا. هێنانەگۆڕی باسی شەڕی
جیهانی دووەم و یاریی بەهێزی چارلی لە
ڕۆڵی ئەدۆلف هیتلەر، ڕەزامەندی گشت
رەخنەگرەکانی لەم فیلمەدا بە دەست هێنا .٣

چارلی چاپلین لە ساڵی ١٩٤٢ لەگەڵ ئونا
ئونیل ئەکتەر و گۆرانیبێژی هۆلیوود ژیانی
هاوسەری پێک هێنا. لە ئەو کاتە چارلی

چاپلین ٥٣ ساڵ و ئونا ئونیل ١٧ ساڵی بوو هەڵبەت چارلی چاپلین‌پێش لەمە، چەند کەڕەتێکی تریش ژنی هێنا بوو، بەڵام چونکە هاوسەر گیرییەکانی ڕەسمی نەبوون، ناکرێت بخرێنە لیستی ژنهێنانەکانی. ئونا ئەویندار ی چارلی بوو و جیاوازی تەمنیان لای گرینگ نەبوو. ئەوان بوون بە خاوەنی هەشت منداڵ. لە نێوان ئەم منداڵانە «ژۆراڵدین چاپلین» کچی جوان وهونەرمەندیان چوو بۆ ناو کۆمەڵی سینەما و بوو بە ئەکتەر.

وردە وردە چاپلین بوو بە خۆشەویست ترین هونەرمەندی مێژووی سینەما و بەرهەم هێنەری کارەکانیشی بە ئەستۆ گرت. بەڵام لە دوایی دا بە بۆنی ئەوەی کە مافیای ئەمریکا چارلی وەکوو زۆریەک لە هونەرمەندانی سەربەخۆی هۆلیوود (بە تاوانی کۆمۆنیست بوون) لە کۆمەڵی ئەکتەری لابرد، چارلی

بەرەو ئەوروپا ڕۆشت و هاوکات لە گەڵ بە جێ هێشتنی هۆلیوود گەڕانەوەی ئەو بۆ ئەمریکا بەرگیری لێ کرا. بەم شێوەیە پەراوێزی یەکێک لە گەورەترین ئەکتەرەکان بەسترا و ساڵانی کۆتایی ژیانی خۆی لە بێ ناوی بە سەر برد. چارلی لە دوای بە جێ هێشتنی ئەمریکا لە ساڵی١٩٥٢ ڕۆیشت بۆ لەندەن و دواتر سویسرای بۆ ژیان هەڵبژارد لەوێ لە گەڵ ژن و منداڵەکانی نیشتەجێ بوو.٤

چارلی دواتر لە چواری مارسی ١٩٧٥ لە لایەن شاژنی بەریتانیا نیشانی سێر و شوالیە ی پێ بەخشرا و هەروەها لە لایەن هۆلیوود بە بۆ پێ بەخشینی خەڵاتی ئۆسکار بۆ ئەمریکا بانگێشکرا.

**چارلی چاپلین لە کریسمەسی ١٩٧٧، بە بۆنەی نەخۆشی دیابێت لە تەمەنی ٨٨ ساڵی دا، لە ژیان ماڵ ئاوایی کرد. ژن و منداڵی ئەو مەراسیمێکی شکۆداریان بۆ کۆچی چارلی بە رێوە برد و چارلی لە گۆڕستانی «کرۆسێر سەرووی» سویسرا نێژرا.**

**دوو مانگ لە دوای ناشتنی چارلی لە سێی مارس ١٩٧٨ز، تەرمی چارلیان لە گۆڕستان دزی. دزەکان لە بەرامبەر دانەوەی تەرمی چارلی پارە یێکی زۆریان لە بنەماڵەی ئەویست ، بەڵام لە لایەن پۆلیس دەستگیر کران و پۆلیسی سویسرا تەرمی چارلی چاپلنیان لە دەریاچەی ژنێو دۆزییەوە و جارێکی تر لە مەراسیمێکی پڕشکۆ بە خاک نێژرا. ئونا هاوسەری چارلی پاش مردنی چارلی رووی کردە مەشروب خواردن و لە ساڵی ١٩٩١ بە بۆنەی شێرپەنجەی گەدەوە کۆچی دوایی کرد.**

لەپاش نزیکەی ١٥ ساڵ بەسەر کۆچی چارلی لە ساڵی ١٩٩٢ فیلمێک بە ناوی چاپلین کە لە ژیانی ئەو گیرابوو، هاتە بەرهەم کە «ڕیچاردئاتێنبێرگ» بەرهەم هێنەری ئەم فیلمە خەڵاتی ئۆسکاری بە دەست هێنا. «ژۆراڵدین» کچی چارلی لەم فیلمە ڕۆڵی دایەگەوەی واتە دایکی چارلی چاپلینی دەگێرا. بەم شێوەیە ژیانی چارلی چاپلین ڕۆیشت بەرەو پەردەی سینەما و کاریگەری کرد لە سەر هەموان.

چارلی جگە لەو کورتە فیلمە بێدەنگاینەی کە هەموو جیهانی بەخۆ سەرسامکردوە نامەیەکی بۆ کچەکەی بە میرات جێهێشتووە ، کە ڕەنگ بێت بۆ ئەوەی چارلی بناسین پێویستە ئەم نامەیە بخوێنیەوە. شتێک زۆر جێگەی سەرسوڕمانە ئەویش ئەوەیە کە

**ئەدۆلف هیتلەر و چارڵی چاپلن لە یەک ساڵ و مانگ و هەفتەدا لەدایکبوون تەنها ٤ رۆژ جیاوازیانە بەڵام یەکەمیان ملیۆنەها خەڵکی چارە ڕەش کردوو و دووەمیان خەڵکی هەموو جیهانی خستە پێکەنین.**

**(ئەدۆڵف هیتلەر)**

**ئادۆڵف هیتلەر (١٨٨٩ ١٩٤٥ ز) پێشەوای پارتی نەتەوەیی سۆسیالیستی ئەڵمانیا ناسراو**

بە (ئاڵمانیای نازی) و ڕابەری ئەڵمانیا لە سەردەمی دەسەڵاتداری پارتی نازی لە ساڵانی ١٩٣٣ هەتا ١٩٤٥ بووە.

هیتلەر لە شەڕی جیهانی یەکەمدا سەرباز بوو و لە ساڵی ١٩٢٠ بوو بە ئەندامی پارتی نازی لە ١٩٢١ دا بووە سەرۆکی پارتەکە.

بەبۆنەی بەشداری لە کوودەتای سەرنەکەوتووی ساڵی ١٩٢٣ ماوەیەک لە بەندیخانە بووە. بە پەرەپێدانی بیرۆکەی نیشتمان پەرەستی و دژایەتی بەرامبەر بە کۆمۆنیزم و جووەکان و هەروەها لێدوانە پڕهەستەکانی بۆ جەماوەر و کاربەدەستان، لە سەرانسەری ئەڵمانیا پشتیوانی بۆ خۆی ساز کرد. لە ١٩٣٣ دا بووە سەرۆک وەزیران و زۆر بە خێرایی دیکتاتۆری بنیات نا. هێندەی ماوە نەخایاند ئەڵمانیا لە بواری سۆپا و پێشکەوتنەکانی سەنعەت بووە یەکێک لە

زلهێزەکانی ئەورووپا. ئاڵمانیا ساڵی ١٩٣٩
بە مەبەستی داگیر کردن ئوتریش هێرشی
کردە سەر چەکوسلۆڤاکیا و پۆلەندا هەر بۆیە
بەریتانیا و فەرەنسا شەریان لەگەڵ ئەڵمانیا
دەست پێکرد. ئەوە بوو جەنگی جیهانی
دووەم دەستی پێکرد. ئاڵمانیا و
پشتیوانەکانیان، هێزەکانی میحوەر و فەرەنسا
و بەریتانیا هێزی هاوپەیمانان بوون. لە سێ
ساڵدا هێزەکانی میحوەر زۆرینەی بەشەکانی
ئەورووپا و ڕۆژهەڵات ئاسیا و باکووری
ئەفریقایان داگیر کرد بەڵام لە ساڵی
١٩٤٢بەدواوە هاوپەیمانەکان دەستیان کرد
بە وەرگرتنەوەی وڵاتە داگیرکراوەکان و لە
١٩٤٥ دا ئەڵمانیا لە هەموو لاوە دەوری
گیرابوو و لە کاتی گرتنی شاری بەرلین
هیتلەر بە فیشەکێک خۆی ئەکووژێت.

بەرپرسایەتی جەنگی جیهانی دووەم بە تەواوی لە ئەستۆی هیتلەر ئەزانن. ئەو شەڕە کووژراو و بریندارێکی زۆری لێکەوتەوە. زۆرترین ژمارەی کووژراوەکان کۆشتنی بە کۆمەڵی جووەکان ئەزانن کە تێیدا نزیکی ٦ ملیۆن کەس کووژران و سووتێنران. ئەو ڕووداوە بە جینۆسایدی هۆلۆکۆست ناو ئەبەن.

## هیتلەر و چۆنیەتی هاتنە ناو دەسەڵات

لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم هیتلەر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا و بەشداری لە مەراسیمی ناشتنی سەرۆکی باڤاری کیرت ئیسنەردا دەکات کە لەو کاتەدا تیرۆر کرابوو. هیتلەر لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ دا بوە بە سیخوڕ لە پۆلیسی ئەڵمانیدا کە سەر بەدەزگای زانیاری هێزی بەرگری نیشتیمانی بوو بۆ ئەوەی بتوانێت کاریگەری بکاتە سەر

سەربازەکان و بچێتە ناو پارتە بچوکەکانەوە ئەو پارتانەی کە کاریگەریان هەیە بۆسەر کۆماری وایمار و بە تایبەتی پارتی کرێکارانی ئەڵمانی. وە کاتێک هیتلەر بۆ سیخوری چوە ناو پارتی کرێکارانی ئەڵمانیاوە بینی کە ئەوە کۆبونەوەیەکی بێ مانایە لە نێوان نزیکەی ٢٥ پیاودا لە مەیخانەیەک بە ناوی (ستیرنیکردباد)بۆ مەی خواردنەوە کۆبونەتەوە و هیچ کاریگەریەکی لەسەر هیتلەر نەبوو، پاشان ئەنتۆن دریکسلەری ناسی کە دروستکەری قفڵ بوو کە دەتوانرێت بە دامەزرێنەری سەرەکی حزبەکە دابنرێت کە لەو کاتەدا لە کۆگای هێلی شەمەندەنەفەر کاری دەکرد پاشان هیتلەر زۆر سەرسام و کاریگەر بو بە بیر و باوەڕەکانی دامەزرێنەری پاڕتەکە کە بەرپەرچ و دژایەتی سامی و سەرمایەداری و بیر و باوەڕی شیوعیەتی دەکرد کە ئەم بیرو باوەڕە

پشتگیری دەکرد بۆ بونی حکومەتێکی سەرکەوتو، کە ئەم هزرە لە پرۆگرامی سۆسیالیستی غەیرە یەهودیەوە وەرگیراوە. ئەنتۆن دیرکسلەر کریکارێکی تەمەن ٣٥ساڵ بوو کە دەربارەی کۆمۆنیست و یەهودیەکان هەمان ڕای هیتلەر هەبوو ئەویش لەو باوەڕەیا بوو کە یەهودیەکان هۆکاری زۆرێک لەو باوەڕە شۆڕش گێڕانەیەن کە زیانیان گەییاندووە بە ئەڵمانیا ئەو توانا بەهێزەی کە هیتلەر لە وتاردانددا هەیبووە بۆتە جێی سەرەنجی ئەنتۆن دریکسلەرو کە داوای لە هیتلەر کردوە بێتە ناو پارتەکەوەو بووە بە ئەندامی ژمارە پەنجاو پێنجەهەمین لە حیزبەکەدا و هەروەها بووە بە ئەندامی حەوتەمی لیژنەی جێبەجێکاری پارتەکە، وە دوای تێپەڕ بونی چەند ساڵێک هیتلەر ئەوەی بڵاو کردەوە کە دامەزرێنەری حەوتەمی حیزبەکە یە. هیتلەر چاوی دەکەوێت بە

دیتریش ئیکارت کە یەکێک بوە لە دامەزرێنەرە یەکەمینەکانی پارتەکەو هەروەها ئەندام بوو لە کۆمەڵەی نهێنی کە بە سول سۆسیتی ناسرا بوو.وە. ئیکارت بوە بە مامۆستای هیتلەر کە فێری چۆنێتی لەبەرکردنی جل و بەرگو قسەکردنی کردووە و ناساندوێتی بە ژمارەیەکی فراوانی خەڵکی، وە بۆ زیادکردنی هەوادارانی پارتەکە هەستا بە گۆڕینی ناوی پارتەکە بۆ پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی نیشتیمانی ئەڵمانیا. هیتلەر لە ئازاری ساڵی ۱۹۲۰ خزمەتی سەربازی تەواو کردەو بەردەوام پشتگیری ئەندامانی دەستەی باڵای پارتەکەی بەدەس دەهینا بۆ بەژداری کردن لە کارو چالاکیەکانی پارتەکەدا،وە لە سەرەتاکانی ساڵی ۱۹۲۱ دا هیتلەر بە شێوەیەکی باش توانی وتار لەبەرامبەر جەماوەرێکی زۆر بدات.ناوبانگی هیتلەر بە خراپی بڵاو بۆیەوە بەهۆی بەهێزی

**کەسایتیەوەی و وتارە تەندو تیژو شەڕەنگێزانیەکانیەوە. پارتەی کرێکارانی ئەڵمانی بارەگایەکی لە ساری میونیخ دامەزراند کە لەو کاتەدا میونیخ شوێنێکی گونجاو بوو بۆ ئەو کەسانەی کە بانگەشەی نەتەوایەتی ئەڵمانیان ئەکرد کە لە نێوانیاندا چەندین ئەفسەری باڵای تێدا بوو کە دژی شیوعیەت بون و پستگیری کۆماری فایمەریان دەکرد کە کۆماریک بوو لەساڵانی ١٩١٩ بۆ ١٩٣٣ دامەزرا لە ئەنجامی دۆراندنی ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا،، وە بە تێپەر بوونی کات هیتلەر توانی سەرەنجی هەموو کەسایەتی هو ئەفسەرە بەناوبانگەکان بۆخۆی ڕابکێشیت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی. پارتەکەی هیتلەر پۆستی دەستەی جێبەجێ کاری پارتەکەیان بە خشی بە هیتلەر بەهۆی بەهێزی و توند ڕەوی کەسایتی هیتلەرەوە،دوا بەدوای ئەوە چەند**

کەسانێک لە پارتەکەدا هەستان بە دروستکردنی هاوپەیمانیەک لە نێوان خۆیاندا لە شاری ئۆکسبۆرگ دژی هیتلەر،ئەمەش هیتلەری ناچار کرد بە گەڕانەوە بۆ میونیخ بۆ ڕوبەڕو بونەوەی ئەو هێرشە توندانەی کە لە کۆتایدا بوە هۆی دەس لەکار کێشانەوەی بە فەڕمی لە پارتەکە لە ١١ ی تەموزی ساڵی ١٩٢٠ داو هەرچەندە ئەوان باش ئەیانزانی کە واز هێنانی هیتلەر مانای کۆتایی هاتنی پارتەکەیە بەهۆی ئەو کەسایەتیە بەهێزەی کە هەی بوو لە پارتەکەدابەڵام دژایەتیان کرد. هەرچۆنێک بێت هیتلەر بڕیاریدا بگەڕێتەوە پارتەکە بەڵام بە مەرجی ئەوەی بچێتە جێگەی دریکسلەری سەرۆکی پارتەکە بە هۆی کە هیتلەر کەسێک بو جەماوەرێکی زۆری هەبوو. پاش ئەوەی کە هیتلەر هاتەوە ناو پارتەکەی وردە وردە پارتەکە بەرەو پیشەوە چو تاکو لە هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکانا

بەژداری دەکردو لە هەڵبژاردنی مانگی ٩ی ساڵی ١٩٣٠ دا کە پارتە کۆماریەکان سەرکەوتنیان تێدا بەدەس هێنا و پارتی نازی توانی لە پڕ بوژانەوەیەکی گەورە بە خۆیەوە ببینێت پاش سەرکەوتنی بە ڕێژەی ١٨,٣% لە هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکەدا و بەمەش پێگەی پارتەکە لە نۆهەمین بچوکترین پارتی پەرلەمانەوە بۆ دووەم گەورەترین پارتی پەرلەمان سەرکەوت، وە پاشان هیتلەر ویستی خۆی کاندید بکات بۆ سەرۆکایەتی ولات، هەرچەندە هیتلەر لە ساڵی ١٩١٣ وە نەمسای جێ هێشتبوو بەڵام نەیتوانیبوو ناسنامەی ئەڵمانی وەربگرێت بۆیە ئەم هۆکارە بوە ڕێگر لەبەردەم خۆ هەڵبژاردنی هیتلەر بۆ هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکان. وە لەو کاتەدا حکومەتی ویلایەتی برونسویک کە ژمارەیەکی زۆر لە نازیەکان ئەندام بون تێیدا هەستان بە دانانی هیتلەر لە پۆستێکی

کارگێڕی بچوک بۆ ئەوەی کە بتوانێت وەک و هاوڵاتیەک ناسنامەی ئەڵمانی وەربگرێت، وەلەو کاتەدا حکومەتی ئەڵمانیا بڕیاری پێدانی ناسنامەی بە هاوڵاتیان دەرکرد و دواجار هیتلەر توانی ناسنامەی ئەڵمانی وەربگرێت و هیچ بەربەستێک نەما لەبەردەمیدا کە ڕێگر بێت بۆ کاندید کردنی بۆ سەرۆکی وڵات. لە کۆتایدا هاوڵاتیە ئەڵمانیە تازەکە هەستا بە کاندید کردنی زۆی بۆ سەرۆکایەتی ولات لە هەڵبژاردنەکاندا لە دژی هیندنبێرگ کە لایەنگریەکی زۆری لە نەتەوایتیەکان و کۆماریەکان و کاسۆلیکەکان و جموریەکانی بەدەس هێنابوو هەروەها پشتیوانی پارتە کۆمەڵایەتی و دیموکراتیەکانیشی بەدەسهێنا بوو. هەروەها لەو هەڵبژاردنەدا کاندیدی پارتی شیوعی و کاندیدی پارتی چەپی تیابوو کە سەربە کۆمەڵەی توندڕەوەکان بوو. لە کاتی

بانگەشەی هەڵبژاردنەکاندا ناوی هیتلەر
بەسەر ئەڵمانیادا بڕا،ئەم نازناوەش
نیشانەیەک بوو بۆ تەماحی هیتلەر بۆ
دیکتاتۆری لە لایەک و نیشانەیەکیش بوو بۆ
ئەو بانگەشە سەرکەوتوەی هیتلەر کە بە
ئاسمانی ئەڵمانیادا بڵاو بۆیەوە،هیتلەر هەستا
بە وتار دان و کۆکردنەوەی لایەنگران
بۆخۆی و کە لە ڕۆژێکدا لە دوو ناوچە
وتاری دەدا ئەمەش سیاسەتیک بوو کە بۆ
یەکەم جار بوو کەسێک بەکاری بێنێت و زۆر
سەرکەوتو بوو. پاش ڕاگەیاندنی ئەنجامەکان
هیتلەر پلەی دوەمی بەدەس هێنا بە ڕێژەی
٣٥% ی دەنگەکانی بەدەس هێنا لە
هەڵبژاردنی دووەم لە مانگی نیسان ،
سەرەڕای جیا کردنەوەی ئەنجامەکان و
بردنەوەی هیندنبێرگ بەڵام هیتلەر وەک و
ڕکەبەرێکی سەرەکی دەرکەوت و نەدەکرا
ئیتربەهیچ جۆرێک غافڵ بکرێت لە گۆرەپانی

سیاسی لە ئەڵمانیادا. پاش ماوەیەک هیتلەر
بە ڕاوێژکار دیاری دەکرهیت و دواتر دەبیت
بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، وە لە
مانگی ٨ی ساڵی ١٩٣٤ دا سەرۆکی وڵات
پاول ڤۆن هیندینبۆرگ کۆچی دوای کردو لە
بری هەڵبژاردنی سەرۆکێکی نوێ ئەنجومەنی
وەزیران کە لەلایەن هیتلەرەوە سەرۆکایەتی
دەکرا بڕیاریدا بە دانانی هیتلەر بە سەرۆکی
نوێی وڵات چونکە وادانرا کە هیتلەر
سەرکردەو ڕاوێژکاریش بوە و سەرۆکی
وڵاتیشە،وە هەروەها هیتلەر هەستا بە
گۆڕینی دەستورو بەو شێوەیە هیتلەر بوە
سەرۆکی دادگای باڵاو سەرۆکی وڵاتیش تاکو
ئەو کاتەی کە هەڵبژاردنیکی نوێ ئەنجام
دەدرێت.بەڵام هیتلەر سەرجەم یاساکانی گۆڕی
بە هەر بیانویەک بیت و بەو وەزیری جەنگی
دەرکرد و خۆی کردە سەرۆکی هێزە
چەکدارەکان و وەزیری جەنگ و سەرجەم

دەسەڵاتەکانی گرتە دەستی خۆی و بێ ئەوەی هیچ کەسێک نارەزای دەرببڕێت و سەرەتای دیکتاتۆریەتی هیتلەر دەستی پیکرد.

## پارتی نازی و بیروباوەڕەکانی

نازی بزوتنەوەیەکی سیاسی بوو کە لە ئەڵمانیادا دەرکەوت لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیدا و لە ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەمدا بەسەرۆکایەتی هیتلەری نازی پاشان گۆڕا بۆ سیستەمێکی سیاسی و هەروەها زاراوەی نازی بۆهەموو ئەو سیستەم و حکومەت و بیرو باوەڕانە دادەنرێت کە لە و پارتە بچێت کە لەو سەردەمەدا لە ئەڵمانیادا دامەزرا.نازی بزوتنەوەیەکی فاشی بوو کە هەموو دەستی بەسەر هەموو ئازادیەکی تاکدا گرتبوو بەڵام ڕێگەی بە خاوەندارێتی تایبەتی دابوو، وە بانگەشەی نازی نەتەوایەتی دوژمنکارانەو

حوكمی عسكەرتارانەیان دەكرد و سەربەرزیان گەڕاندەوە بۆ ئەڵمانیاو سەرجەم گەلەكانی تری باكوری ئەوروپا كە بە ڕەچەڵەک دەچونەوە سەر ئاریەكان، وە پۆلێنێكیان بۆ نەتەوەكان كرد كە یەهودیەكان وسلاڤیەكان و نەتەوەكانی تر لە خوارەوەی پۆلێنەكەدا بوون. نازی دژایەتی دیموكراتی و شیوعیەت و سۆشیالیستی دەكرد لەگەڵ سەرجەم سیستەمە سیاسیە جیاوازەكانی تركە بانگەشەی یەكسانیان دەكرد. نازی بە هەموو ئەو كێشە ئابوری و سیاسیانەدا تێپەڕی كە لە دوای جەنگی جیهانی یەكەمەوە لە ساڵی (١٩١٤-١٩١٨) توشی ئەڵمانیا هاتبوو هەروەها حكومەتی دیموكراتی جێگەی پاشایەتی گرتەوە كە بۆ ماوەیەكی زۆر حوكمی ئەڵمانیای كردبوو، بەڵام وڵات توشی هەڵ ئاوسانێكی گەورە بوو وە بێكاریەكی گەورە لە دوای جەنگەوە توشی ئەڵمانیا بو

بوو وه زۆربەی ئەڵمانیەکان لایەنگری خۆیان
گۆڕی بۆ ئەو گروپە سیاسیانەی کە
بانگەشەی گۆڕانکاری توند ڕەوانەی دەکرد.
وە ئەم پارتە لەسەرەتادا ناوی پارتی
کرێکارانی ئەڵمانیا بوو بە هاتنە ناوەوەی
هیتلەر لە ساڵی ١٩١٩ و گەیشتنی بە خێرایی
بە پۆستی سەرۆکایەتی پارتەکە ناوی
پارتەکەی گۆڕی بۆپارتی کرێکارانی
سۆشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانیا لەساڵی
١٩٢٠دا. هیتلەر لەسەرەتادا ئامانجی
سەرەکی ئامانجێکی نیشتیمانی بوو بەڵام
لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی بەرپاکردنی شۆڕشێکی
کۆمەڵایەتی دا بوو بۆ بەدەسهێنانی لایەنگری
هاوڵاتیان بۆخۆی ، وە پارتی نازی
گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی لە
ئەنجامی ئەو گرفتانەی کە لەدوای کۆتای
هاتنی جەنگی جیهانیەوە توشی ئەڵمانیا
هاتبوو، هیتلەرپشتگیری هیزی سەربازی

دەکرد بۆ ڕێکخستنی سیستەمی سیاسی و هەوروەها داگیرکاری لە ڕێگەی سەربازیەوە و هەستا بە چاکسازی کۆمەڵایەتی کە بەم هۆیەوە سەرسنجی جوتیارەکان و چینەکانی ناوەندی بۆخۆی ڕاکێشا و هەروەها پشتگیری سەرمایەدارەکانی کرد بۆ دژایەتی شیوعیەت. ئەمانەش هەمو هۆکار بوون بۆ فراوان بون بونی نازی لە ئەڵمانیاداو کە لە ساڵی ١٩٢٣ دا پارتی نازی نزیکەی ١٧٠٠٠ ئەندامی هەبوو. گەیشتن بەدەسەڵات لە لایەن نازیەکانەوە پشتگیریەکی جەماوەری بەهێزی بەدەس نەهێنا هەتا ئەو کاتەی کە جیهان توشی قەیرانێکی گەورە هات کە لەساڵی ١٩٢٩ وە دەستی پێکرد، لەمەو دوا ئەڵمانیەکان بە لێشاو دەچونە ناو پارتی نازیەوە و پارتەکەش لە لای خۆیەوە بەڵێنی چاکردنی باری ئابوری و بەهێزی دەسەڵات و گەڕانەوەی سەربەرزی نیشتیمانی بە

ئەڵمانیەکان دا. وەلە هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٣٢ دا پارتی نازی وەک و پارتێکی بەهێز دەرکەوت لە ئەڵمانیاد و لە ٣٠ یەنایەری ساڵی ١٩٣٣ دا هیتلەر بوە ڕاوێژکار(سەرۆک وەزیران) و بە خێرای ڕوی کردە دیکتاتۆری و ئازادی تاک و ئازادی سیاسی قەدەغە کرد و سەرجەم پارتە سیاسیەکانی داخست جگە لە پارتی نازی نەبێت، هەروەها دەستی گرت بەسەر ڕۆژنامەو ڕاگەیاندەکان و خوێندندا، وە هەستان بە دروستکردنی سیستەمێکی ئاسایشی بەهێز و دروستکردنی چەندین بەندیخانەی گەورە بۆ ئەو کەسانەی کە دژایەتی پارتی نازیان دەکرد لەو سەردەمەدا. پاش فراوان بونی جەنگەکان هیتلەرو دەستو ۆێوەندەکەی خەونیان بە دروستکردنی ئیمپراتۆریەتی نازیەوە دەبینی کەدەس بەسەر هەمو جیهاندا بگرێت و لەساڵی ١٩٣٨ دا دەستی کرد بە جێ بەجێ کردنی پلانەکەی و

هێزەکانی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٨ دا نەمسا یان داگیر کرد و وە لە ساڵی دواتر چیک و سلۆڤاکیا ی پێشویان داگیر کرد، وە هەروەها لەساڵی ١٩٣٩ دا هێرشیان کردە سەر پۆلەندا و دواتر جەنگی جیهانی دووەم دەستی پێکرد و کە ئەڵمانیاو هاوپەیماننەکانی شکستیان هێنا لە ساڵی ١٩٤٥ و حوکمی نازی لەناوبرا.

## (فریدریش نیچە)

فرێدریش ویلهێلم نیچە فەیلەسۆفی بەناوبانگ، خەڵکی ئەڵمانیا (لە دایکبوون ١٨٤٤-کۆچی

دوایی ١٩٠٠)؛ خاوەن بیر و ڕای ڕەخنەگر لە ئایین و فەرهەنگ.

نوسراوەکانی نیچە شێوازی تایبەتی خۆیان هەیە و وەک نووسراوەکانی تری سەردەمی خۆی نیە. ئاهەنگی نووسراوەکان لە گوێی خوێنەر وەک شیعر وایە. هێندێ لە قسەکانی بە خێرایی و ڕووتی وتە و بڕێکیتر لە کەلامدا. بەڵام بە گشتی سەرانسەر نووسراوەکانی ، وشە بە وشە خاوەن مانای خۆیانن و زۆربڵێیی نەکردووە.

لە ساڵی ١٨٤٤ی زایینی لە پرۆس لەدایک بوو. لەبەر یەک بوونی ڕۆژی بە دونیا هاتننی لەگەڵ ڕۆژی بە دنیا هاتنی فرێدریش ویلهێلمی چوارەم پاشای ئەو کاتەی پرۆس، باوکی بە شانازیەوە فرێدریش ویلهێلمی ناو نا. خۆی سەبارەت بەو ڕووداوە لە کتێبێکیدا دەڵی :

ئەو یەکسان بوونە ، بە قازانجم بوو لەبەر ئەوەی تەواوی دەورانی منالّیم ڕۆژی لە دایکبونم ڕۆژی جەشنی گشتی بووە.

باوکی پیاوی ئایینی خاچپەرستان بوو. فرێدریش منالّی یەکەم بوو دوای ئەویش دوو منالّی دیکەیان بوو. کاتێ ٥سالّی بوو باوکی دەمرێ و لە خێزانێکدا پێکهاتوو لە دایکی و خوشکی و داپیر و دوو پووری گەورە دەبێت. ئەو فەزا ژنانە و کاریگەری ئایین لەسەر ئەو ژنانە ڕەنگدانەوەی گرینگی هەبوو لە بیر و ڕای نیچەدا لە ڕۆژانی داهاتووی ژیان.

لە تەنیاییدا کاتێ تایبەتی تەرخان ئەکرد بە خوێندنەوەی ئنجیل و لێکۆڵینەوەی. جاربەجار کۆپلیەکی وا بە هەست بۆ دۆستانی ئەخوێندەوە کە فرمێسکی لە چاو ئەهاتە

خوار. لە چوار ساڵیدا دەستی بە خوێندن و نووسین کرد و لە ١٢ ساڵیدا شیعری دائەنا.

بە بۆنەی نەخۆشین و ژانە سەر دوابەدوای یەک مامۆستایەتی زانکۆ بەڕەڵا کرد. لە ڕەفیقانی دوور کەوتەوە و تەنیایی هەڵبژارد. هاووڵاتی بوونی پرۆسی خۆی بەتاڵ کردەوە و تا کۆتایی ژیانی بێوڵات مایەوە . لە وڵاتانی ئەڵمانیا ، ئیتاڵیا و فەڕەنسا ئەم شار و ئەو شاری دەکرد و هەر لەو ڕۆژانەشدا بوو گەورەترین بەرهەمەکانی وەدی هێنا.

لە ١٩٠٠دا دوای کێشانی مەینەتی زۆر بەدەست نەخۆشینەوە، جەڵتەی مێشکی کرد و دڵی لە لێدان کەوت.

بیر و ڕاکان سەبارەت بە نیچە جیاوازن. لەبەر قسەکانی سەبارەت بە ژن هێندێ کەس بە دژە ژنی ئەناسن. بەڵام ڕوون نیە

مەبەستی ڕاستەقینەی چی بووە لەو دوور کەوتنیەی لە ژن.

ئەگەرچی ڕێزی بوو بۆ خاچپەرستی ڕەسەن ، بەڵام بە تەواوی هێزی، دژە ئایینەکان بەتایبەت خاچپەرستی سەردەمی خۆی قسەی ئەکرد.

(جۆزێف ستالین)

جۆزێف ستالین (لەدایکبوون ١٨٧٨ - کۆچی دوایی ١٩٥٣) ڕابەر و سیاسەتوانی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بو کە لە نێوانی ساڵانی

٢٠ی تەمەنی تاکوو کاتی مردن ڕابەرایەتی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤیەتی لە ئەستۆ بوو. زۆر کەس بە بەرپرسی کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤی ئەزانن کە ژمارەیان نێوان ٤ تا ٢٠ ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێت.

ناوی کاتی لەدایک بوونی یوسف ویسارینۆڤیچ جۆگاشڤیلی (بە زمانی گورجی، زمانی زکماکی: იოსებ ბესარიონის ძე ჯუღაშვილი).

لە ساڵی ١٩٢٢ گەیشتە پلەی سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤیەت. دوای مردنی ڤیلادیمیر لینین، ستالین توانی بەسەر لیۆن ترۆتسکی سەرکەوێت و ڕابەرایتی حیزب بگرێتە دەست. لە ساڵانی

١٩٣٠ خاوێنکردنەوەی گەورەی بەڕێخست که زنجیره سەرکوتی سیاسی و دەستبەسەر کردن و کوشتنی ناڕازییەکان بوو که لە ساڵی ١٩٣٧دا گەیشتە بەرزترین پلەی خۆی.

ستالین بڕوای وا بوو که سیاسەتەکانی لەسەر بنەمای مارکسیسم-لینینیسم پێکهاتووە بەڵام ئێستا هەموان سیستەمی ئابووری و سیاسیی ئەو بە ئەستالینیسم ناو دەبەن.

لە ساڵی ١٩٢٨دا ستالین بە گۆڕینی پلانە ئابوورییەکان و دانانی پلانی کشتوکاڵی هەڵبژاردەیی، یەکیەتی سۆڤیەت تا کۆتایی ساڵانی ١٩٣٠ لە وڵاتێک بە زۆرینە جەماوەری جووتیار بوو بە یەکێک لە زلهێزەکانی بواری سەنعەت لە جیهاندا.

داگیر کردنی گەنم و خواردمەنیەکانی دیکە لە لایەن کاربەدەستانی سۆڤیەت و بە دەستووری ستالین لە ساڵانی ١٩٣٢تا ١٩٣٤ بووە هۆی هاتنی قڕ و قاتی لە وڵاتانی ژێردەسەڵاتی ئۆکراین، قەزاقەستان و قەفقازی باکوور. هەرکەس لە جووتیارەکان کە دژایەتی ئەوەی بکردایە کۆلاک ناویان دەنا و سەرکوت و دەسبەسەر دەکرا.

لە کاتی شەڕی جیهانی دووهەم ئەستاڵین ڕابەری یەکیەتی سۆڤیەت بوو و دەورێ گرینگی هەبوو لە شکەست هێنان بە ئەڵمانیای ژێر دەسەڵاتی نازیەکان. ئەوە سۆڤیەتی کردە یەکێ لە دوو زلهێزی دونیا و ئەوە بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ واتە تا کۆتایی ژیانی ئەستالین هەر مایەوە.

هێندێ کەس حکوومەتی ستالین بە دەسەڵاتی تاکەکەسیی دەناسن و هەروا بە لەنێو بردنی کەسایەتیەکانی دەژ بەو تاوانباری دەکەن.
نیکیتا خرۆشۆڤ، جێگری ئەستالین، کەسایەتی و شێوازی حوکمڕانی ستالینی لە کۆبوونەوەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٥٦ کێشایە ژێر پرسیار و دواتر دەستی کرد بە خاوێنکردنەوەی حکومەت لە هاوڕێیانی ستالین.

## ستالین و لینین

بۆماوەی ١٠ ساڵ کاری سیاسی ئەکات و لەوماوەیەدا چەندین جار ئەگیرێت و تەنانەت لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٣ تا ١٩١٧ چەندین جار بۆ سیبیریا دورئەخرێتەوە، دوای ئاشنا بون بە فلادیمێر لینین باوەڕهێنان پێی لە ساڵی ١٩١٢دا ئەبێتە ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی بەلشەفی و لەساڵی ١٩١٣دا

ناوی "ستالین"ی لێ ئەنرێت کە بەمانای
پیاوی پۆڵایین دێت. بەپێی هەندێک لە
گێڕانەوەکان لینین ئەم نازناوەی ستالین
بەخشیوە دوای ئەوەی لەکاتی بۆیاخ کردنی
کۆشکی قەیسەردا بۆمبێکی دەستی هەڵداوە
بۆ قەیەسر و دواتر دەست بەکاربۆتەوە هەر
وەک ئەوەی هیچ روی نەدابێت. دوای مردنی
لینی لە ساڵی ١٩٢٤ حکومەتێک پێکهێنرا بە
سەرۆکایەتی هەر یەک لە ستالین و کامینیف
و زینوفیف، بەهاوکاری ئەو دوانە ترۆتسکی
دور خرایەوە، دواتر بوخارن و ریکۆفیش
کامینۆف و زینۆفیف دورخرانەوە، لەساڵی
١٩٢٧دا دەسەڵاتی بوخرنی کەم کردەوە و
لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٨-١٩٢٩ بو بە تەنها
سەرکردەی پارتی کۆنۆنیستی، بەڵام تا کاتی
پاکسازی گەورە دەسەڵاتی رەهای بەدەست
نەهێنا.

## پۆلیسی نهێنی ستالین و کاری سیخوڕی و پاکتاوی جەستەیی

سەردەمی حوکمی ستالین بە سەردەمی ئاگر و ئاسن ناو دەبرێت، ئەو هەر ئەوەندەی دەستی واڵا بوو، ئیتر کەوتە وێزەی نەیارەکانی خۆی، هەرچەندە دەزگاکانی پۆلیسی نهێنی وەک ( چیکا- Tsjeka ) پاشان ( گپو- GPU) لەکاتی لەنینیشدا هەبوون، بەڵام لەسەردەمی حوکمی ستالیندا گەیشتنە ئەوپەڕی دەسەڵات و دڵڕەقی.. لە چوارچێوەی ئەم شێوەکارانەدا ستالین پۆلیسی نهێنی ناوخۆ و دەرەوەشی دروستکرد، لەژێر چاودیری راستەوخۆی خۆیدا چەندین تۆڕی جاسوسی و دژە جاسوسی لە وڵاتانی وەک ئەڵمانیا و بەریتانیا و فەرەنسا و ژاپۆن و ئەمەریکا، بڵاو کردەوە، یەکێک لە کارە دیارەکانی ئەم دەزگایانەی ستالین ئەوە بوو کە ساڵی ١٩٤٠ لە مەکسیک توانیان دەستیان

بگەیەننە ترۆتسکی و لەناوی بەرن. ستالین جیاوازی لە نێوان کاری سیاسی و پروپاگەندەی حزبی و جاسوسی نەدەکرد بۆ ئەو هەموو یەک ئامانجیان هەبوو، کۆنفرانسی ئەنتەرناسیۆنالی سێهەمی بۆ ئەم مەبەستە خستە خزمەت خۆیی و تەواوی هەوڵەکانی خۆی خستەگەڕ بۆ ئەوەی هەموو پارتە کۆمۆنیستەکانی دنیا دڵسۆزو مل کەچی سۆڤیەت و ستالین بن و لە وڵاتەکانی خۆیاندا لە بەرژەوەندی ئەم ڕێبازە وەگەڕیانخات، لەناوخۆی وڵاتیشدا هەرکەس و گروپێک بۆچونیان جیاواز بوایە بە ناوی خیانەت بە شۆڕش وسوشیالیزم و بەکرێگراوی بێگانە لە لایەن ئەم دەزگا پۆلیسانەوە دەستگیر دەکران و دووچاری چارەنوسی نادیار دەبوونەوە.

## شاڵاوەکانی کوشتن و پاکتاوی گەورە

**کوژرانی سێرگی کیرۆف ( Sergej Mironovitsj Kirov ) لە یەکی دیسێمبەری ١٩٣٤ سەرەتای دەستپێکردنی گەورەترین شاڵاوی کوشتن و پاکتاوکردن بوون لە سەردەمی ستالیندا، کیرۆف لەساڵی ١٩٣٠ دا بوو بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزب، یەکێک بوو لە کەسایەتیە خۆشەویست و ناسراوەکانی حزب، زۆرێک لە ئەندامان داوای ئەوەیان لێکرد لە کۆنگرەی هەڤدەهەمینی حزبدا شوێنی ستالین بگرێتەوە و خۆی بۆ سەرۆکایەتی حزب کاندید بکات، هەرچەندە ئەو خۆی لایەنگری ستالین بوو، هەر خۆشی ئەم چیرۆکەی بۆ ستالین باس کرد، بەڵام ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ئیتر ستالین ئەو وەک دوژمنێکی خۆی بناسێت، لەکۆنگرەدا وێرای فێڵ و تەلەکەبازی ستالین کیرۆف ١٦٦ دەنگی هێناو تەنها بە یەک دەنگ لە دووای ستالینەوە بوو. کیرۆڤ لە**

نوسینگەکەی خۆی لە شاری لینینگراد بە فیشەکێک کوژراو بووە هۆی ئەوەی حزبی کۆمۆنیست بەتەواوی بهەژینێت، ئەمەش هەلی بە ستالین بەخشی کە ئیتر بە راست و چەپی خۆیدا نەیارانی خۆی بە ناوی خائن وهەڵپەرست و دژە شۆڕش و ئۆپۆزیسیۆنەوە پاکتاو بکات، بە سەدان ئەندامی حزب و ئەفسەری سوپای سورو کارمەندانی دەوڵەت و تەنانەت هاوڵاتیانی سڤیلیش کەوتنە بەر ئەو شاڵاوانە.. ستالین خۆی سەرپەرشتی دادگاکانی دەکردن لە مۆسکۆ ، لە تەواوی وڵاتیشدا دادگای هاوشێوە دانران. ئەم دادگایانە ناسرابوون بە دادگاکانی مۆسکۆ و بە سەرکردایەتی ( ئەندرێ ڤیژینسکی) بەڕێوە دەبران، چوار دانە لە پرۆسەکانی دادگایی کردن بایەخێکی زۆر گرنگیان هەیە لە مێژوی روسیادا کە ئەوانیش ناسراون بە :

دادگایی کردنی شازدە کەس لە مانگی ئۆگستۆسی ١٩٣٦ .

دادگایی کردنی هەڤدە کەس لە مانگی ژانیوەی ١٩٣٧ .

دادگایی کردنی مارشاڵ تۆخاچاڤسکی و چەندی ئەفسەرو پلەبەرزی سوپای سور لە مانگی ژونی ١٩٣٧ .

دادگایی کردنی بیستویەک کەس ( لە ناویاندا بوخارین ) لە مانگی مارتی ١٩٣٨ .

شاڵاوەکانی کوشتن و پاکتاو کردن بە پلەی یەکەمین ئەندامانی حزبەکەی خۆی دەگرتەوە، کار گەشتە ئەوەی کە پاش کوشتنی ترۆتسکی لە نێو ئەندامانی کۆنی مەکتەبی سیاسی سەردەمی لینیندا تەنها سێ کەس مابوونەوە ئەوانیش جگە لە ستالین خۆی میخائیل کالینین و مۆلۆتۆڤ بوون! کتێب و نوسین و

مێژوش لەم کردەوانە بەدەر نەبوون، مێژوو بە دڵی ستالین دەنوسرا و لە کتیبی قوتابخانەکاندا بەجۆریک باسی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەکرا کە بە تەنها لەنین و ستالین ئەنجامیان دابێت و ناوی کەسی دیکە نەدەهینرا... راگواستن و کۆچی زۆرەملێ :
هەر لە ساڵی ١٩٢٩ بەدوواوە ئیتر ستالین کەوتە جێبەجێ کردنی نەخشەکانی خۆی بۆ سەرلەنوێ بنیات نانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت و گۆڕینی بۆ وڵاتێکی سەنترالیزمی بەهێز.هەرچەندە ستالین خۆی لە قوتابخانەی ئاینی ئەرتۆدۆکسی خوێندویەتی بەڵام باوەڕی مارکسیزم و لینینزم سرۆشی ئەوەی.
بەو دەبەخشی کە ئاین بەتەواوی لە بنەوە هەلتەکینێت و لەناوی بەرێت باوەڕدارانی ئاینیی دەستگیر دەکران، کەنیسەو مزگەوتەکان قەدەغەکران، لە جیاتی هەموو ئەمانە حزب و دامەزراوەکانی حزب

ئەڵتەرناتیف بوون، ئەو دودڵ نەبوو لەوەی
ئاین بخاتە خزمەت ئایدۆلۆجیای خۆیەوە، لەم
ئانوساتەدا ستالینیزم وەک ڕێبازێک لە برەو
سەندندا بوو، بۆیە ئەو خۆی لە جیاتی
حەزرەتی مەسیح نیشان دەدا، تابلۆی تایبەت
بە ستالین بڵاو دەکرانەوە کە هاوتای
وێنەکانی یەسوعی مەسیح بوون ، کارگەشتە
ئەوەی کە ستالین لە تابلۆی ( دوواهەمین
خوان) لە ژوور سەری مەسیحەوە یەکێک
بێت لە دووازدە یاوەرەکەی...هەر ناوچە و
دەڤەریک بەرامبەر بە سیاسەتە ئابوریەکانی
ستالین هاوکاری تەواوی نەکردایە ڕاگواستن
چارە نوسی بوو، سەدەها کەس بە تۆمەتی
ئاغا و سەرۆک هۆز و کۆلاک بوون ڕەوانەی
سیبریا کران. پرۆسەکانی ڕاگواستن و کۆچی
زۆرە ملە لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم و
پاش جەنگ گەشتنە ئەوپەڕی، پتر لە یەک
ملیۆن و نیو مرۆڤ کە سەربە نەتەوە

جیاوازەکان بوون بۆ سیبریا و کۆمارەکانی سەنترالی ئاسیا دوور خرانەوە ، ئەم پرۆسانە بوونە هۆی ئەوەی کە سروشتی دیموگرافی وڵات بشێوێت و زۆرێک لە جەنگ و ململانێکانی ئەمڕۆ بە تایبەت لە ناوچەکانی قەوقاز دەرئەنجامی ئەو کارانەی ستالینن، هۆیەکانی راگواستن و کۆچی زۆرەملەی خەڵکی لە زاری حکومەتی سۆڤیەتەوە بریتی بوون لە هاوکاری نازیەکان، خیانەت کردن بە وڵات ، یاخی بوون و داوای سەربەخۆیی بوون.

## ژمارەی قوربانیەکان

ژمارەی قوربانیەکانی ئەو پرۆسانەی لە سەرەوە ناومان بردن ئاشکرا نین، لە سەردەمی جەنگی ساردا ئەم ژمارەیە بە شێوەیەکی خەیاڵی زیاد کراوە و گەشتۆتە نزیکەی چل ملیۆن کەس، پاش هەڵوەشاندنەوە و لەناوچوونی یەکیەتی

سۆڤیەت لەساڵی ١٩٩١ زانیاریەکان تاڕادەیەک ئاشکرا بوون، هەرچەندە ژمارەی دروست و تەواوی قوربانیەکان هەرگیز نەزانراوە بەڵام باس لەوە دەکرێت کە نزیکەی ٨٠٠ هەزار کەس بە تاوانی سیاسی و نا سیاسی لەناو براون و ئەگەر قوربانیانی راگواستن و کۆچی زۆرەملەی بخریتە سەر ئەوا پێکەوە خۆی لە نزیکەی ٣ ملیۆن نەفەر دەدات... هەرچۆنێک هەژمار بکرێت هەتا ئێستا ژمارەی دروستی قوربانیەکان نەزانراون و لەم بارەوە چەندین سەرچاوەی جیاواز ئاماژە بۆ ژمارەی جیاواز دەکەن، نوسەری روسی ڤادیم ئەرلیکمان ژمارەی قوربانیەکان بە ٩ ملیۆن کەس لە قەڵەم دەدات کە لەوانە ملیۆن و نیوێک بە تۆمەتی سیاسی و نا سیاسی جیاواز لەناو براون. رۆبەرت کانگۆئیست ژمارە تەواوی

قوربانیەکانی سەرەتا بە ٣٠ ملیۆن کەس ناو دەبرد پاشان کردنی بە بیست ملیۆن.

## مردنی ستالین

رۆژی ٥ی ئازاری ١٩٥٣ ستالین لە ماڵەکەی خۆیدا لە کونتسەڤۆ کۆچی دووایی کرد، هەتا ئێستا سەبارەت بە هۆکاری مردنی ستالین هیچ ئاشکرا نەبووە ، بەڵام سەرچاوە فەرمیەکانی حکومەتی سۆڤیەتی ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو بە نەخۆشی فشاری دەماخ کۆچی کردووە. هەندێک سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لاڤرێنتی بەرییا ( Lavrenti Beria ) ستالینی دەرمانخوارد کردبێت، هۆکاری ئەمەش ئەوە بووە گویا بەرییا هەستی بەوە کردووە کە ستالین لەناوی دەبات چونکە ئەو دەسەڵاتی زۆری پەیدا کردبوو، بەرییا کاری بۆ ئەوە کردووە کە پاش دەرمانخواردکردنی ستالین هەتا ماوەی ٢٤ کاژێر هیچ دکتۆرێک نەتوانێت سەردانی

بکات. یەکێکی دیکە لە چیرۆکەکانی مردنی ستالین باس لەوە دەکات گویا ستالین بە درێژایی رۆژێک لە ژورەکەی خۆی نەهاتۆتە دەرەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ کەس بۆی نەبووە بێزاریکات ، کەس نەیوێراوە لە دەرگای بدات و هەواڵی بپرسێت، بە درێژایی ئەو رۆژە هەتا مۆڵەتی چونە ژوری ستالین وەرگیراوە و کەسێک بۆی هەبووە بچێتە ژورەکەی ستالین لەسەر فەرشی ژورەکەی خۆی لەپەلوپۆ کەوتووە و پاشان بە فشاری دەماخ مردووە.. لاشەکەی ستالین بە مۆمیاکراوی لە رۆژی ٩ی ئازاردا لە رێورەسمێکی گەورەدا لە پاڵ دامەزرێنەری یەکیەتی سۆڤیەت ڤلادیمیر لێنین دەنێژرێت، ساڵی ١٩٦١ لاشەکەی گوێزرایەوە بۆ دیواری کرەملن و لەوێ نێژرا. ساڵی ١٩٩١ لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە و کەرتوپەرت بوونی سۆڤیەتدا، جۆرجیاش سەربەخۆیی راگەیاند و

لە تەواوی وڵاتدا هەموو پەیکەرەکانی ڤلادیمیر لینین و جۆزێپ ستالین شکێنران، بەڵام لە سەدان کەس لە گۆڕەپانی شاری گۆری کۆبوونەوەو پەیکەرەکەی ستالینیان پاراست.. لە مانگی ژونی ٢٠١٠ دەسەڵاتدارانی جۆرجیا بە شەو پەیکەرەکەی ستالینیان داگرت، ئەم پەیکەرە برۆنزە و شەش مەتر درێژە ، لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمەوە لە شوێنی لەدایک بوونی ستالین لە گۆڕەپانێکدا دانرابوو، بەڵام بەهۆی جەنگی ساڵی ٢٠٠٨ لە نێوان روسیاو جۆرجیادا ئەو پەیکەرە برایە مۆزەخانەیەکی تایبەت بە ستالین لە هەمان شارو لە جیگای ئەودا یادگارێکی قوربانیەکانی ئەو جەنگە دانرا.

# (ماو تسی تۆنگ)

ماو تسی تۆنگ (لە دایکبوون ، ٢٦ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٣ – مردن ٩ی ئەیلوولی ١٩٧٦) گەورەی کۆمۆنیستەکانی چین بووە لە ساڵانی ١٩٣٥ەوە هەتاکوو مردنی واتا ساڵی ١٩٧٦. ماو لەساڵی ١٩١٨ مامۆستای زانکۆی پەکین بووە و ئەو کات ئاشنای کۆمۆنیزم بووە و بۆتە کۆمۆنیستێکی دەمارگیر و ئێستا بیرکردنەوەی ئەو بە ماویزم دەناسرێت و کۆمۆنیستەکان بیرکرنەوەی ئەو و مارکس جیاواز دەبینن. لە بەرەبەیانی ١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٩ شۆڕش هەڵگیرسا و بە ناوی «شۆڕشی ڕۆشنبیری» ناسرا. ماو تسی تۆنگ لە کۆشکی ئیمپراتۆری چین کۆماری چینی بە ئایدیای کۆمۆنیستی ڕاگەیاند و لەو کاتەوە

حیزبەکەی لە دەسەڵاتدایە تاکوو ئێستا.
خەڵکی چین لەمەڕ ماو دوو جۆر بۆچوونیان هەبووە، ئەوانەی پێیان خراپ بووە بە تاوانباری کوشتنی میلیۆنان چینی لە قەڵەم دەدەن و ئەویان بە کارامە نەدەزانی بۆ حوکمڕانی کۆماری چین بەڵام کۆمۆنیست و چەپەکانی چین ئەویان بە پاڵەوانی گەلەکەیان لە قەڵەم دەدا و بەپارێزەری چینی ژنان و کرێکاران دەزانی و ئەویان بە باشترین کەس دەزانی بۆ ڕووبەڕووبوونەی سەرمایەداری.

یەکێک بووە لە گەورەترین بکوژەکانی مێژوو کە نزیکەی ٤٥ ملیۆن کەسی کووشتووە .

# (ئەبراهام لینکۆڵن)

ئەبراهام لینکۆڵن( لەدایکبووی ٢ ی شوباتی ١٨٠٩،لە ١٥ ی نیسانی ١٨٦٥ مردوە)،ئەو ١٦ هەمین سەرۆکی
ئەمریکابوو،خزمەتکردنی دەستپێکرد لە ئازاری ١٨٦١ هەتا ئەو کاتەی تیرۆر کرا لە نیسانی ١٨٦٥.لینکۆلن سەرکردایەتی ئەمریکای کرد لە شەری سڤیل،خوێناویترین شەر،وە رەوشتێکی زۆر بەرز،دەستوریەت و ئەزمەی سیاسی،وە پارێزەری یەکگرتوی بوو لە ئەمریکا،کۆیلەی رەتکردەوە،حکومەتی ناوەندی بەهێز کرد،وە ئابوری رێک خستەوە.

لە هۆدگێنفیل،کنتاکی لەدایک بووە،لینکۆلن گەشەی کرد تا سنوری رۆژئاوای ولایەتی

**کنتاکی و ئیندیانا،خۆی خوێندەوار کرد،وە بوە پارێزەر لە ولایەتی ئیلینوێ،وە بوە سەرۆکی حزبی ویگ،وە بوە ئەندامی پەرلەمانی ئیلینوێ،کە لە ١٨٢٣ تا ١٨٤٦ خزمەتی کرد،بۆ پەرلەمانی ئەمریکا خۆی پالێوا لە سالی ١٨٤٦.**

## (جان ئێف. کێنیدی)

**جۆن فیتزگیرالد کینیدی (ماوەی ژیان:٢٩ی ئایاری ١٩١٧ تاکوو ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ لە ٤٦ ساڵیدا) ،کەسایەتی سیاسیی ئەمریکی و ٣٥ سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، سەرەتا ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرابووە دوتر بۆتە ئەندامی ئەنجومەنی پیران، لە ساڵی ١٩٦٠ و**

لەتەمەنی ٤٣ ساڵیدا لەلایەن حیزبی دیموکراتیەوە هەڵبژێردرا بۆ سەرۆکایەتی ئەمریکا و لەئەنجامدا لە ریتشارد نیکسۆنی ڕکابەری بردەوە و بۆیە یەکەم کاسۆلیکی کە سەرۆکایەتی ئەمریکا بگرێت دەست و هەروەها بەبچوکترین سەرۆکی ئەمریکا هەژمارکراوە. جۆن کینیدی لەکاتێکی هەستیار و دژواردا لەماوەی جەنگی سارددا سەرۆکایەتی ئەمریکای گرتە دەست و خاوەنی هەڵوێستی بەهێز بووە لەبەرامبەر سوڤێتدا لەهەموو ڕویەکەوە، هەر ئەمەش وایلێکردووە لەهەموو سەرۆکەکانی دیکەی ئەمریکا گرنگتربێت لەلایەن خەڵکیشەوە خۆشەویستربێت، لەهەرە ڕوداوە گرنگەکان لەسەردەمی حوکمڕانی جۆن کینیدیدا کردەوەی هەڵکوتانی کەنداوی بەرازەکان و قەیرانی مووشەکی کوبا و دروستکرنی دیواری بەرلین و گێبرَگێی داگیرکردنی ئاسمان

کە بەوە ناسراوە بەڵێنی داوە مرۆڤ بخاتە سەر زەوی. لە ساڵی ١٩٦٢ کۆپتەرەکانی cia وینەی چەند مووشەکیەکیان گرتووە کە لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە لەکوبا دادەمەزراوە و ئاڕاستەکەشی بەرەو ئەمریکا بووە و توانای هەڵگرتنی سەری نەوەویان هەبووە هەر بۆیە جۆن کینیدی ڕوبەڕوی مەترسیدارترین بڕیار بۆتەوە لەمێژودا، ئەگەر هێرش بکاتە سەر مووشەکەکان ڕەنگە جەنگێکی نەوەوی لێبکەوێتەوە و زۆربەی وڵاتانی جیهان کاول بوایە ئەکەریش دەستەوسان بوەستێت و هیچ نەکات مووشەکەکان مەترسی لەسەر ئەمریکا دروست دەکەن و پێگەی ئەمریکاش لاواز دەبێت ئەگەر وەلامی مووشەکەکان نەداتەوە، لەکۆتاییدا بڕیاریدا هێزی دەریاوانی ئەمریکا ڕەوانە بکات تاکو ڕێگە بەسۆڤێت نەدات پڕۆژەی دروستکردنی ئەو مووشەکان

تەواوبکات. دواتر لەگەڵ نیکیتا خرۆتشۆڤی سەرۆکی سۆڤێت ڕێکەوتوونە لەسەر ئەوەی مووشەکەکانی سۆڤێت لە کوبا لابرێت بەمەرجێک ئەمریکا کوبا داگیرنەکات. جۆن کینیدی ناسراوە بەو سەرۆکەی بەڵێنی داوە کە مرۆڤ بگاتە سەر مانگ و بەسەلامەتیش بگەڕێتەوە سەر زەوی لە ٢٢ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ لەتەمەنی ٤٦ ساڵیدا کە بەسەردانێکی ڕەسمی لە شاری دەڵاس بووە بەفیشەک کوژراوە.

# (هەری troومەن)

هەری trooومەن (ماوەی ژیان:٨ی ئایاری ١٨٨٤ تاکوو ٢٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٢) ، ٣٣یەم سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو و ئەندامی حیزبی دیمورکرات ، هاری ترومان تەنیا یەک ساڵی فەمانڕەوایی ئەمریکای کرد ئەویش لەنێوان ساڵانی (١٩٥٣ تاکوو ١٩٥٤) بوو ئەوەش لەبەر ئەوە بوو فرانکلین ڕۆزڤێلت مرد و ئەو جێگای گرتبۆوە ئەو کاتەشی هاری ترومان جێگای گرتەوە جیهان لەنێو جەرگەی جەنگی جیهانی دووەم بووە، بە بڕیاردان لەسەر بەکارهێنانی دوو بۆمبی ئەتۆمیی دژی ییابان

، کۆتایی بە یەکێک لە خوێناوی ترین جەنگ هێنا لە مێژووی مرۆڤایەتیی.

## (فرانکلین ڕۆزڤێڵت)

فرانکلین ڕۆزڤێڵت لە ٣٠ جانێوەری ١٨٨٢ لەدایک بووە، ٣٢هەمین سەرۆکی ئەمریکا بووە یەکێک بوو لە کاندیدکراوەکانی پارتی دیمووکرات لە ئەمریکا بۆ سەرۆکایەتی لەساڵانی ١٩٣٣ بۆ ١٩٤٥ کەدەکاتە ١٢ ساڵ بەمەش بەیەکەم سەرۆکی ئەمریکا سێ خول سەرۆکی ئەو وڵاتە بێت لەماوەی سەرۆکایەتیدا ڕۆزڤێڵت ڕووبەڕووی دوو گەورەترین ڕووداوی مێژویی بووەوە

ئەوانیش قەیرانی گەورەی ئابووری و شەڕی جیهانیی دووەم بوون کەتیایدا ڕۆزڤێڵت لەهەردوو قەیرانەکە سەرکەوتووانە دەرباز بوو هاوکات لەدوای ئەوە بۆ خولی سێیەمی سەرۆکایەتی هەڵبژێردرایەوە بەڵام بەهۆی کۆچی دواییکردنییەوە بەنەخۆشی نەیتوانی لەپۆستەکەی بەردەوام بێت ، گۆڤاری تایم بە ١٠٠ لە کەسایەتییە سەرکردەکانی جیهانی سەدەی بیستەمی داناوە ، لەساڵی ١٩٢٠یش کرا بە یاریدەدەری سکرتێری دەریایی ئەمریکا ، لەساڵانی ١٩٢٩ تاکوو ١٩٣٣ بووە بە پارێزگاری نیویۆرک

دەمەزراندنی نەتەوەیەکگرتووەکان

لە ١٤ی ئۆگەستی ساڵی ١٩٤١، لە کۆبوونەوەیەکی نێوان سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی بەریتانیا، وینستۆن چێرچیل، لەگەل سەرۆکی وولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای ئەوکات کە فرانکلین ڕۆزفلتە،

بڕیاری دەست پێشخەری کۆمەڵێک هەنگاو درا. ئەم دۆکۆمێنتە واژوو کرا لە نێوان هەردوو ناوبراو لە سەر کەشتی‌یەک "لە شێوێنێکی ناو دەریا". ئەم دۆکۆمێنتە ناودەبرێت بە پەیمانی ئەتلەنتیک. کە دوایی کاری بۆ کرا و ئەو ڕێکخراوەی لێکەوتەوە کە ئێستا ئەیبینین کە دواجار ڕێکخراوەکە لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ دامەزرا.

## (ئیرنستۆ چێ گیڤارا)

شۆڕشگێڕ و ئازادیخوازی ئەرجەنتینی چێ گیڤارا، لە ساڵی ١٩٢٨ لە شاری ڕۆزارییۆی ئەرجەنتین دا لە دایک بوو و لە ١٩٦٧ لە سەر کێوەکانی ئاند دا کوژرا.

بنەماڵەکەی چێ گیڤارا لە بنەڕەتی باسک و ئیرلاندی بوون و بیروڕایەکی چەپگەڕیان هەبوو. گەرچی لە نەخۆشیی هەناسەتەنگی ئازاری دەبرد بەڵام توووانی بێتە وەرزشکار. لە ماڵیان دا گرتووپەری ٣٠٠٠ پەرتووک هەبوو کە بوونە هۆی ئەوە چە بێتە خوێنەرێکی بەجۆش و بەفڕ. لە ساڵی ١٩٥٣ دا لە زانکۆی بۆنۆس ئایرێسی پایتەختی ئارجێنتینا دا پزیشکی خۆی تەواو کرد. کاتێک وا هێشتا خوێندەکار بوو لەگەڵ هەڤاڵەکەیەوە

ئالبەرتۆ گرانادۆ دەستیان بە ڕێوینگیکی لە ئامەریکای باشوور کرد. بیرەوەرییەکانی ئەو ڕێوینگییە وەکوو ڕۆژنووسەکانی مۆتۆرسیکلە نووسراوە. پاشان، دەچێتە مەکسیکا و لەگەڵ فیدەل کاسترۆ ئاشنا دەبێت و لەگەڵ ئەودا دەست بە شۆرشێک لە دژی ڕێبەری و دەسەڵاتداری دکتاتۆری کووبا باتیستا بە ئارمانجی رزگاری دەکەن. بە ساڵان لە شاخ و کێوەکان و شەخەڵ و جەنگەلەکان دا تێکۆشینی پێشمەرگایەتییان هەبوو تاکوو کووبایان لە دەستی دیکتاتۆری ڕەسکاند. دووای ئەم سەرکەوتنە چێ وەکوو وەزیری سنعەتەکان لە کووبا هەلبژێردرا بەڵام قەبولی نەکرد و بۆ درێژە دانەوە بە ئارمانجەکانی ڕێگای بۆلیڤییای پێش گرت داکوو-وەها کە خۆی دەیوت گەلێکی دیکەی ئامەریکای لاتین لە بندەستی دەستمایەداری (ئیمپەریالیسم) برەسنێت و رزگار بکا.

**له بۆلیڤییا دا هێزەکانی Barrientos له شەونخوێنێک دا له نزیکی Higueras چێ دەگرن. دووای ئەوە بە برینەک له پێی دا له بەندیخانەی شاری Higueras دا بەندی دەکەن. چێ لە بەر هیچکەسێکەوا سەری نەچەماند. دوایین ووتەکانی چێ زۆر بەواتە و گرنگن:«... مردن بە سەر پێوە لە ژییان بە سەر گۆچان زۆر چاکترە».**

**لە رۆژی ٩ ئۆکتۆبەر ١٩٦٧، کاتژمێر ١٠:١٣ دا بە فەرمانی دەولەتی یەکگرتووی ئامەریکا و سەرڤیسی ئاساییشەکەی و بە ئەرێنیتی سەرۆککۆماری ئەو سەردەمەی بۆلیڤیا، René Barrientos، بە دەستی Mario Terán بە نۆ گولّە کوژرا.**

به دووای لەگییانکردنی چێ ڕێبەرایەتی بۆلیڤییا لە بڕیارەکەی پاشگەز و پەشیمان دەبێتەوە، چوونکە بەم کارە چێ، ئێدی بوو بە ئەفسانەی شۆڕشگێڕی و ئازادیخوازی. دوژمەنەکانی وا رامان دەکەن کە ئەگەر زیندوو بمایای، بیرووڕا و ناوی ئەم هەندە لە جیهان دا بەڵاو نەدەبوو.

Juius Lester لە بارەی مەرگی چێ وا دەڵێ: «مەرگی چێ، گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کە مرۆڤێکی وەک چێ ژییاوە. بۆ لە ناو بردنی چێ، ئێوە دەبێ هەموو خەڵکی جیهان لە ناو ببەن، ئەوەش کە ناکرێ!»

# (فیدڵ کاسترۆ)

فیدڵ ئالێخاندرۆ کاسترۆ ڕووز لەدایکبووی ١٣ی ئابی ساڵی ١٩٢٦ە، شۆڕشگێڕ و سیاسەتوانێکی خەڵکی کووبایە کە لە ١٩٥٩ەوە تاکوو ١٩٧٦ سەرۆکوەزیر و، پاشان، لە ١٩٧٦ەوە تاکوو ٢٠٠٨ سەرۆککۆماری ئەو وڵاتە بووە. پاش دەست لەکارکێشانەوەی لە پۆستی سەرۆکایەتی، براکەی، ڕاول کاسترۆ بوو بە سەرۆکی کووبا. فیدڵ کاسترۆ بناغەدانەری حیزبی کۆمۆنیستی کووبا -تەنها حیزبی قانوونیی ئەو وڵاتە-یە.

فیدڵ ئەلیخاندرۆ کاسترۆ، کەسایەتیەکی سەربازیە و لەڕێگای شۆڕشی سەربازیەوە لە ساڵی ١٩٥٩ تاکو ساڵی ٢٠٠٨ بۆتە سەرۆکی کوبا، لە ١٣ ئۆغستسی ساڵی ١٩٢٦ لە خێزانێکی جووتیار لەدایک بووە،

ساڵی ١٩٤٥ پەیوەندی بە زانکۆی هاڤاناوە کردووە و یاسای خوێندووە، لەساڵی ١٩٥٠ تەخەڕوجی کردووە و وەکو پارێزەر کاری کردووە، هێزێکی جەنگی دژ بە فۆلگینسیۆ باتیستا پێک هێناوە و هێرشیان کردۆتە سەر یەکێک لە بارەگا سەربازیەکان و ٨٠ کەسیان لێکوژراوە و خۆشی دەستگیرکراوە و بە ١٥ زیندانی حوکمدراوە و لە ساڵی ١٩٥٥ ئازاد کراوە و نەفی کراوە بۆ مەکسیک، خۆیی ڕائوولی برای سەرقاڵی بەرپاکردنی شۆرششبوون و چێ گیڤاراش پەیوەندی پێیانەوە کردووە و کاسترۆی ناسیوە و بۆتە بەشێک لە کۆمەڵە شۆڕش گێڕەکە.

لە ساڵی ١٩٥٦ کاسترۆ دەستی بەشۆڕش کردووە دژ بەحکومەتی کوبا و ناو بەناوە هێرشی کردۆتە سەر حکومەت، بەپاڵپشتی میللی و هاتنلا هێزە چەکدارەکانی حکومەتی

کوبا بۆ ناو ڕیزی شۆڕشەکەی جەختی لەسەر حکومەتی هاڤانا دروستکردووە و لە ساڵی ١٩٥٩ دوای ئەوەی لە لێدوانێکدا داوای مانگرتنێکی گشتی و گشتگیر کردووە، سەرۆکی حکومەت و سەرۆک کۆماری ناچار کردووە بەهەڵهاتن و بەسەرکردایەتی چێ گیڤارا گەشتونەتە هاڤانای پایتەخت.

فیدڵ کاسترۆ ساڵی ١٩٦٥ سکرتێری حیزبی شیوعی کوبا بووە و سیستمی وڵاتەکەی بەرەو شیوعیەت و دەسەڵاتی تاکە حزب بردووە، ساڵی ١٩٧٦ بۆتە سەرۆکی ئەنجومەنی دەوڵەت و ئەنجومەنی وەزیران و باڵاترین سەرکردەی سەربازی بووە، دوای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٦ نەشتەرگەری کردووە جڵەوی دەسەڵاتی داوەتە دەست ڕائول کاسترۆی برا بچوکی، لەساڵی ٢٠٠٨ بەپێنج ڕۆژ پێش کۆتایی هاتنی ماوەی

دەسەڵاتدارێتیەکەی ڕایگەیاندووە کە چیتر ئارەزووی کاری سیاسی نەماوە، واتا لە ١٩ فبرایەری ساڵی ٢٠٠٨ دەستی لەسەرۆکایەتی کوبا و سەرکردایەتی سوپا کێشاوەتەوە و ڕائولی برای جێگەکەی گرتۆتەوە.

فیدڵ ئەلیخاندرۆ کاسترۆ لەڕێگای سایتەکانی سەر بە باڵیۆزەکانی کوباوە ژمارەیەک ووتار بەناونیشانی تێڕامانەکانی کاسترۆ بەهەموو زمانەکانی جیهان بڵاودەکاتەوە.

# (ئەلبێر کامو)

ئەلبێر کامۆ (لەدایکبوون ٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٣ – مردن ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٦٠) نووسەر و ڕۆژنامەنووس و فەیلەسوفێکی فەڕەنسی بوو.

ئەلبێر کامۆ لە ٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٣دا لە شاری مۆندۆڤیی جەزائیر لەدایکبووە، باوکی بە ڕەگەز فەرەنسی بوو، کرێکاری کارگەیەکی مەی دروستکردن بوو، دایکی کامۆش بە ڕەگەز ئیسپانیی‌یە واتە کامۆ جەزائیری نەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرترین کاتی ژیانی خۆی لەوێ بەسەربردوە و هەر لەوێش مردووە، لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕی جیهانیی یەکەمدا باوکی کامۆ بەشداری ئەو شەڕەی کرد و لە شەری ڕاماندا بریندار

کرا و پاشانیش هەر بە هەمان هۆوە و لەبەر خراپی برینەکەی گیانی لە دەستدا، کامۆ دەڵێت «وەکوو منداڵانی دیکە لەگەڵ دەنگی دەهۆڵی جەنگدا بە هەتیوی گەورە بووە کە درامایەک بووە لە کوشتن و بڕین و زوڵم و زۆرداری.»

لەپاش مردنی باوکی لەگەڵ دایکی و خاڵی و برا گەورەکەی و نەکیدا چوونەتە جەزائیر و لەوێ لە گەڕەکێکی هەژارنشیندا بە ناوی بلکۆر سەر لە نۆی درێژەیان بە ژانیان داوەتەوە. لە ساڵی ١٩٣٠ کامۆ تووشی نەخۆشی سیل هات کە بەو هۆیەوە گەلێک ئازار و ئەشکەنجەی بینیوە. لە ساڵی ١٩١٨-١٩٢٣ خوێندنی سەرەتایی تەواو کرد و پاشانیش لە قوتابخانەی «لیسیەی فەرەنسی» قۆناغی ئامادەیی لە ساڵی ١٩٣٠ دا تەواو کرد.

ئەلبێر کامۆ زۆر حەزی لە ئەدەب کردووە، لەبەر ئەوە هەموو بەرهەمە ئەدەبیەکانی سەردەمی خۆی خوێندۆتەوە بە تایبەتی نووسینەکانی ئەندریە ژید و بە باشیش یەکتریان ناسیوە. ئەلبێر کامۆ بڕوانامەی بەکەلۆریا و لیسانسی لە بەشی فەلسەفەی کۆلیژی ئادابی زانکۆی جەزائیر وەرگرت بە هۆی ئەو شارەزاییە زۆرەی کە لە بواری ئەدەبدا هەیبوو ناسراوی لەگەڵ چەند مامۆستایەکی شارەزای ئەم بوارەدا هەبووە کە بەشێوەکی راستەخۆ کاریان تێکردوە وەک پۆل ماتیە و جان جیرینیە و ئەندریە ماڵرۆ. لە ساڵی ١٩٣٦ دا بۆ وەرگرتنی دیبلۆم لە خوێندنی باڵادا ،پاش ئەوە نامیلکەیەک دەربارەی پەیوەندی نێوان نهێلستی و مەسیحیەت لەلای ئەفلاتون و سانت ئۆگستین پێشکەش دەکات و ئیتر پاش ئەم نامیلکەیە

واز لە خوێندن ئەهێنێت بە هۆی نەخۆشیەوە و ناتوانێت درێژە بە خوێندن بدات، بەڵام لە بواری نووسینی ئەدەبی و فیکری و رۆژنامەگەری و سیاسیدا چالاکانە دەست بە خوێندنەوە دەکات، وەک بەرهەمەکانی تۆلستۆی و مارک نۆریل و مارکیزدی سادو بێرلیرڤی و دانێل دوفۆدو سرڤانتس و بلزاک و مەدام دی لاڤایت و سوریل و نێتچەو ئیشپنگلەر.

ئەلبێرکامۆ بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٣٤ دا ژنی هێناوە و پاش ساڵێک جیابۆتەوە بەڵام جارێکی تر ژنێکی فەرەنسی هێناوە بەناوی فرانسین فاوەر لەو ژنە کچێک و کوڕێکی هەبوە بەناوی جان و کاترین،لەدوای داگیرکردنی پاریس لە لایەن ئەڵمانیاوە پاریس بەجێدەهێڵێت و دەچێتە شاری کلێرمۆن لە خوارووی فەرەنسا پاشانیش دەچێت بۆ لیۆن تا کانونی دووەمی ١٩٤١ لەوێ َدەمێنێتەوەو

هەر لەو ساڵەشدا دەگەڕێتەوە بۆ وەهران و خۆی بە وانە وتنەوەوە سەرقاڵ دەکات. بە مەبەستی چارەکردنی نەخۆشیەکەی جارێکی دیکە گەراوەتەوە بۆ پاریس و هەر بۆ هەمان مەبەست سەردانی ئەمریکای کردووە بەڵام هیچ کام لەو هەوڵانەی سوودیان نەبووە، کامۆ تا دەهات نەخۆشییەکەی پەرەی دەسەند و باری تەندروستی خراپتر دەبو، کامۆ لە ژیانیدا ئێش و ئازارێکی زۆری بەدەس نەخۆشییەوە بینیوە. لە ساڵەکانی نێوان ١٩٤٨وە هەتا سالی ١٩٥٧ گەلێک شاکاری جوان و کتێبی بە پێزی لە بواری شانۆو ئەدەب و سیاسەتدا بلاوکردۆتەوە. وەک ڕێزلێنان لە کارەکانی لە ساڵی ١٩٥٧ خەڵاتی نۆبڵی پێدرا، ئەلبێر کامۆ لەسالی ١٩٦٠ لە جەزائیر لە یەکێک لە شەقامە گشتییەکاندا بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆ دەکێشێت بە درەختێک دا و دەمرێت.

## (ئال پاچینۆ)

ئەلفرێد جەیمز پاچینۆ ناسراو بە ئەلپاچینۆ لە دایک بوو ١٩٤٩زایینی ئەکتەری سینەما و شانۆ و دەرهێنەری ئەمریکی و یەکێک لە بە ناوبانگترین هۆنەرمەندەکان لە زەماندایە.

ئەل ناسیاوە بە بینینی دەوری : مایکەل کۆرلیۆنێ لە سێدانەیی باوکی ئاییینی(Godfather)، سانی ڤۆرتزیک لە دوانیوەڕۆی سەگی( Dog Day Afternoon)، تۆنی مۆنتانا لە سەر و چاو بریندار (Scarface)، فرەنک سێرپیکۆ لە سێرپیکۆ(Serpico)، کۆلۆنەل فرەنک

سلەید لە بۆنی خۆشی ژن . ئەلپاچینۆ ساڵی ١٩٩٢ دوای ٧جار پاڵێوراوی ، لە لایەن ئاکادمی ئاوارد (Academy Award) بووە بەرندەی خەڵاتی باشترین ئەکتەر بۆ کایە لە فیلمی بۆنی خۆشی ژن .

ئاڵ پاچینۆ لە شاری مەنهاتن سەر بە ویلایەتی نیویۆرکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، لە بنەماڵەیەکی ئەمەریکی-ئیتاڵی هاتە دونیاوە. ناوی دایکی ڕۆز و ناوی باوکی سالْواتۆرە ئەلفرێد پاچینۆ و هەردووکیان لەدایک بووی شاری کۆرلێۆنەی سیسیلی ئیتاڵی بوون. لە منداڵیدا دایک و بابی لە یەک جودا ئەبنەوە و ئاڵ دەگەڵ دایکی ژیان ئەباتە سەر. ئاڵ پاچینۆ زۆری پێخۆش ئەبێ بڕواتە قۆتابخانەی The School of Performing Art لە شاری نیویۆرکدا؛ هەر ئەو قوتابخانەی وا ئەکتەری سەرەکی فیلمی باوکی ئایینی٢ the Godfather

Part II، ڕۆبێرت دێنیرۆ ئەیویست لێی بخوێنێ. ئاڵ پاچینۆ لە تەمەنی ١٧ساڵیدا لە قوتابخانەکەی خۆی بە هۆی دەرنەچوونی لە زۆرینەی دەرسەکانی ، دەر کرا. دایکی ئاڵ ئەوەی پەسند نەدەکرد و ئەو کێشەیە بوو هۆی ڕۆشتنە دەرەوەی ئاڵ پاچینۆ لە ماڵەوە. ماوەیەکی زۆر لەم شوێن و لەو شوێن کاری بێ نرخی ئەکرد تەنها بۆ ئەوەی بە ئارەزووی بگەیەت.

بە نرخترین ئەزموونەکانی کایەکردنی لە شانۆکانی نادیاری نیۆیۆرک و دواتر لە ئەستۆدیۆی هێربێرت بێرگهۆف Herbert Berghof Studio دا دیت. هەر لەوێش بوو وا مامۆستای ئەکتەری چارلی لاگتۆنی ناسی بووە ڕفێقی. لەو سەردەمەدا ئاڵ پاچینۆ زیاتری کاتەکان بێ ماڵ بوو و مەجبوور بوو

له ماڵی ڕفێقانی تەنانەت له سەر شانۆ یا شەقام بخەوێ.

ساڵی ١٩٦٢ دایکی کاتێ ٤٣ ساڵی بوو، مرد. هەر لەو ساڵەدا باپیری ئاڵ، جەیمز جێراڕدی، یەکێک له کاریگەرترین کەسایەتیەکانی ژیانی ، چاوە نایه یەک.

ئەگەرچی ئاڵ پاچینۆ قەد ژنی نەهاوردووە، بەڵام سێ منالی هەیە؛ Julie Marie لەدایک بووی ١٩٨٩ و هەر وەها دوانەیەک به ناوەکانی Anton James و Olivia Rose له دایکبوونی ٢٠٠١ له دەسگیرانه کۆنەکەی Beverly D'Angelo که له ساڵانی ١٩٩٦هەتا ٢٠٠٣ پێکەوە بوون.
ئەل دەگەڵ دایانا کیتۆن (Diane Keaton) هاوکایەکی له سێدانەیی باوکی ئایینیدا پەیوەندی هەبوو بەڵام ئەو پەیوەندیه تاوتاوە دوای فیلمی باوکی ئایینی ٣ کۆتایی پێ هات بۆ هەمیشه.

## وتەی پاچینۆ

**بێتوانایيم .. كامەيە بێتوانایيم ؟ پێویستە كەمێ بیر بكەمەوە .. پێم وایە ! ئەو وەڵامەمم دەبێ كاتێ لێم بپرسی كامەیە بەهێزیت ئەشێ هەردوو یەک بن ..**

# (نێلسۆن ماندێلا)

نیڵسۆن ماندێلا (لە دایکبوون ١٨ی تەمووزی ١٩١٨- مردن ٥ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٣) لە ئەفریقای باشوور لە دایکبووە لە زنجێکدا لە گوندێکی بچووکی هەرێمی ترانسکایی، ساڵی ١٩٤٦ دەبرێت بۆ دورگەی رۆبیبین لە ئەنجامی هەوڵی ماندبوونی ئاشتیانەی ماندێلا و هاورێکانی بۆ سەربەخۆی ئازادی بیرکردنەوە وتن و رەخساندنی کەشێکی لەبار بۆخەڵکی ئەفەریقای باشوور، بۆیە ساڵی ١٩٩٠ دی کلێرک سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەفەریقای باشوور لە راگەیاندنێکی چاوەروانننەکراودا وتی دەبێت رێگا بە (ANG، PAG) پارتی کۆمۆنیست بدرێت و ٣١ رێکخراوی دیکەی سیاسی هەموو ئەو بەندیانەی کە تاوانی توندوتیژیان نەکردووە

ڕیگەیان پێ بدرێن کاری خۆیان بکەن و هەموو لە سێدارە دانێک هەڵبووە شێتەوە. ئەفەریقای باشوور لەو شەوەدا گۆرا و ئالای ANG لەهەوادا دەشەکایەوە و چیدی ماندێلا قەدەغەنەبوو ،ماندێلا لەنێوان ساڵانی ١٩٩٤ تا ١٩٩٩ سەرۆکی ئەفریقیای باشوور بوو لە ئێستادا ماندێلا وەک سیموبووڵی ئاشتی و مافی مرۆڤ لە وولاتان دەناسرێت ، ماندێلا لەساڵی ١٩٩٣ دا خەڵاتی نۆبێل ی لە ئاشتیدا پێبەخشرا,

ماندێلا ناوی تەواوی (رۆلیهلا لا نیڵسۆن ماندێلا)یە، لە ١٨ی تەمموزی ساڵی ١٩١٨ لە ترانسکای ئەفریقای باشوور لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی هەر لە ئەفریقا دەستپێکردووە، لە دوای دروستکردنی چەندین ئاستەنگی لەبەردەمیداو بۆ ئەوەی دای ببڕن لە خوێندن، بەڵام ئەو هەر سووربوو لەسەر درێژەدان بەخوێندنەکەیی و

توانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس بەدەستبێنێت.
ماندێلا سەر بە خانەوادەی (مادیبا)یە کە خێزانێکی بەناوبانگن لە ئەفریقای باشوور، باوکیشی یەکێک بووە لە سەرۆکەکانی خێڵی (تیمبۆ)، بۆیە دوای مردنی باوکی ڕاستەوخۆ ماندێلا دەستنیشانکرا کە جێگەی باوکی بگرێتەوە.

لە کتێبی تایبەتی نیلسۆن ماندێلا دا بەناوی (دیالۆگ لەگەڵ خۆمدا) کە وەرگێڕدراوەتە سەر ٢٢ زمانی جیاجیای جیهان و تایبەتە بە ژیانی خۆی، ئەو خۆی باس لە ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت:

"ئەو کوختەی منی تیا دەژیام، هیچ جۆرە پێویستییەکی تیانەبوو، من لەسەر حەسیر دەنووستم، زەوی کوختەکە هیچ جۆرە

ڕاخەرێکی بۆ دانیشتن تیانەبوو، تا ماوەیەکی زۆریش نەمدەزانی سەرین چییە! خواردنمان تەنها ئەو شتانەبوو کە خۆمان بەرهەممان دەهێنان، دایکم خۆی گەنمە شامی دەچاندو درەوی دەکرد. لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بووم بەشوان و چاودێری مەڕ و ماڵاتم دەکرد، هەر لەو دەشتانەدا وانەی تازە فێربووم، ڕاوی باڵندە بەقۆچەقانی و کۆکردنەوەی هەنگوین و میوە و ڕیشەی خۆراک و خواردنەوەی شیری گەرم و شیرین، مەلەکردن لە ڕووبارەکاندا و ماسی گرتن بە قولاپ. منیش وەک هەموو منداڵەکانی تیرەی خوسا، تەنها لە ڕێگەی بینینەوە هۆشیاریم پەیداکردو فێری زانست بووم. ئێمە زانیاریمان بەهۆی چاولێکردنەوە بەدەستهێنا، نەک لەڕێی پرسیارکردنەوە، پرسیارکردن لەناو خێزانی ئێمەدا زۆر زەحمەت بوو، کە بۆ یەکەمجار لە ماڵی یەکێک لە سپی پێستەکاندا منداڵەکانم

بینی چۆن پرسیار لە باوک و دایکیان دەکەن سەرم سوڕما، باوکم‌و دایکم ئەوەیان پێناخۆش بوو، دەبوو ئێمە رێز لە هەموو داب و نەریتێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی بگرین و حەرام و حەڵاڵ بزانین.

خەڵکی پەیڕەویان لە باوو باپیریان دەکردو ژنانیش، هەرچیەکیان بە میراتی بۆ مابووە، ملکەچی بوون لێیان لانەئەدا، ئەگەر یەکێک بەهەر شێوەیەک بێڕێزی بەرامبەر باوو باپیرانی بکردایە، دەبوو بەرامبەر بەو تاوانە بڕواتە لای سەرۆک یان جادوگەری خێڵ تاوەکو داوای لێخۆش بوون بکات، ئەمانە لای من ئاسایی بوو سەرەتای ژیانی من ئاوا دەستیپێکرد."

ماندێلا لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا ئەوە دەگێڕێتەوە، کە کاتێک دایکی لە گوندەکەیەوە بەناوی گوندی (کیونو) بۆ خوێندن دەیبات بۆ گوندێکی پێشکەوتوتر بەناوی گوندی (مەکهکزون)و لەوێ لە ماڵی سەرۆک خێڵێکدا، کە هاوڕێی باوکی بوو دەمێنێتەوە. وەک هەستێکی منداڵی، بەتەواوی خۆی وەک لادێیەک دێتە بەرچاو و شەرم دایدەگرێت، بەناچاری خەمی ئەوەی لێدێت کە چۆن لەگەڵ ئەو دۆخە تازەیەدا رابێت، هەست بەدواکەوتووی دەکات و لەگەڵ (ڤینسی) کچی قەشەیەکدا پەیمان دەبەستێت، پیاسەی لەگەڵ دەکات و دڵی بەدەستدەهێنێت، بەڵام خوشکە گەورەکەی ڤینسی گاڵتەی بەو خۆشەویستیە دێت و دەیەوێت بە هەر شێوەیەک بێت خوشکەکەی پەشیمان بکاتەوە، چونکە بەردەوام پێی، دەڵێت: "ئەو کوڕە گوندیی و

کێوییە، دواکەوتووە و هیچ لە ئەتەکێتی شارستانێتی نازانێت".

هەر بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیە، خوشکەکەی ڤینسی ڕۆژێک بۆ نیوەڕۆ خوانێک داوەتی ماندێلا دەکات، ماندێلاش پێش ئەوەی دەست بە خواردن بکات، دەکەوێتە هەستکردن و چاودێری ئەوانی تر دەکات تا بزانێت ئەوان چۆنو بە چ شێوەیەک ناندەخۆن، ئەو هەروا فێر بووە کە بەدەست نان بخوات، بەڵام کە دەبینێت میوانەکانی تر چەقۆ و چنگاڵ بەکاردەهێنن، ئەویش چاویان لێدەکات و هەر بەو دەستورە دەکەوێتە گیانی باڵە مریشکێک، بەڵام چەند دەکۆشێت ئەو کارەی بەچاکی بۆ ناکرێت، ئەوەندە چەقۆ و چنگاڵ بەقاپەکاندا دەکێشێت کە ئەوانی تر لە تەقە تەقەکەی ڕادەمێنن‌و بێزار دەبن و دەکەونە تەماشاکردن، خوشکە گەورەکەی لە ڤینسی

ڕادەمێنێت و وەک پێی بڵێت، پێم نەوتیت ئەو کوڕە چ گوندیەکە، بەڵام ماندێلا وەک خۆی دەڵێت: "من هەر ئارەقەم دەڕشت و نەمدەویست دان بە شکستەکەمدا بنێم و بەدەست باڵە مریشکەکە بخۆم، بۆیە ئەو ڕۆژە تا ڕادەیەکی زۆر بەبرسێتی مامەوە".

لە شوباتی ساڵی ١٩٦٢ ماندێلا دەستگیرکراو بە سزای پێنج ساڵ زیندانی حوکمدرا، ئەویش بەتۆمەتی سەفەرکردن بۆ دەرەوەی وڵات بەشێوەیەکی نایاسایی و ڕێکخستنی مانگرتن و توندتیژی، هێشتا ماوەی حوکمی پێنج ساڵەکەی زیندانی کۆتایی نەهاتبوو، جارێکی دیکە حوکمدرایەوە بەدرێژایی هەموو ژیانی، ئەمجارەیان بەتۆمەتی پلان دانان بۆ کردەوەی چەکداری، واتە سزاکەی هەتا هەتایی بوو، چونکە ئەوکات تۆمەتی ئەوەیاندایە پاڵ ماندێلا کە ئەو خیانەتی لە وڵاتەکەی کردووە، بەڵام وەکو چاودێران، دەڵێن: "ئاکارو

ڕەوشتی ماندێلا، هەمیشە خاڵی بووە لەخیانەت و بیری جوداخوازی".

دوای ئەو هەموو جیاوازییەو هەستکردن بەو دژایەتیکردنەی کە لەڕەش پێستەکان دەکرێت، ماندێلای رەش پێست بەو هەستە پڕەوە بەگژ بیروباوەڕی ئاپارتایتدا دەچێتەوە کە بەپێی ئەو ئایدیایە دەبوو سپی پێست لەسەرووی رەشپێستەکانو هندیەکانەوە بن، واتە دەبێت سپی پێست هەمیشە بەسەرۆکی بمێنێتەوە، ئەگەرچی کەمینەی دانیشتوانی وڵاتەکەش بن، لەو رووەشەوە ماندێلای تێکۆشەر لەڕێگەی چالاکیە سیاسییەکانیەوە بووە سەرۆکی کۆنگرەی میللی ئەفریقا، کە گەورەترین رێکخراو بوو لەسەر ئاستی هەموو کیشوەرەکەو داوای یەکسانیو نەهێشتنی نەژادپەرستی ئازادییان دەکرد لەئەفریقای

باشووردا. بەڵام دەسەڵاتدارە ڕەگەزپەرستەکان هەستیان بەمەترسی ئەو لاوە ڕوناکبیرو ئازادویستە کردووە، هەر بۆیە بۆ ماوەی ٢٧ ساڵ لەبەهاری لاوێتیەوە دەیخەنە زیندانەوە، تا ساڵی ١٩٩٠ و لەتەمەنی حەفتاو دوو ساڵیداو لەژێر فشارێکی نێودەوڵەتیدا ئازادکراو بووە سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتەو خەڵاتی نۆبڵی ئاشتیشی پێبەخشرا.

ماندێلا دوای ڕزگاربوونی لە بەندیخانە، لە ساڵی ١٩٩٢ لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە خەڵاتی ئاتاتورکی پێ بەخشرا و داوای سەردانی ئەو وڵاتەی لێکرا، بەڵام بە توندی داواکەی ڕەت کردەوە و بە حکوومەتی ئەنقەرەی وت: «من نایەم بۆ وڵاتێک خوێنی کورد بڕژێت و سیاسەتی جیاکاری لەگەڵ گەلی کورددا جێبەجێ بکات»؛ بەڵام دواتر لە ساڵی ١٩٩٩ خەڵاتەکەی وەرگرت.

نێلسۆن ماندێلا سەرۆکی پێشوی ئەفریقای باشور لە تەمەنی ٩٥ ساڵیدا دوای مانەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ لە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد.

## (مارتن لوسێر کینگ)

مارتن لۆسێر کینگ (لەدایکبووی ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ – مردن ٤ ی نیسانی ١٩٦٨) پیاوی ئایینی و چالاکوانێکی ئەمەریکایی بوو، سەرکردەی دیاری بزوتنەوەی مافە مەدەنیەکانی ئەفریقی-ئەمەریکیەکان بوو. کینگ بەوە ناسراوە کەسایەتیەکی دیارە لە هەوڵەکانی بەڕێوە

پێش بردنی مافەکانی مرۆڤ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و جیهان، بە بەکارهێنانی ڕێگای ناتوندوتیژی بە فێربوون لە ماهاتما گاندیەوە. کینگ زۆرجار بە سەرکردەیەکی پاڵەوان دادەنرێ لە مێژووی لیبرالیزمی هاوچەرخی ئەمریکا. کینگ لە ساڵی ١٩٦٤ بوو بە لاوترین کەس کە خەڵاتی ئاشتیی نۆبێل وەربگرێت بە هۆی کارەکانی بۆ کۆتایی هێنان بە جیاکاری نەژادی بە ڕێگای "یاخیبوونی مەدەنی" و هەندێ ڕێگەی ناتوندوتیژی دیکە. لە پێش مردنی لە ساڵی ١٩٦٨، ئەو دیسان هەوڵەکانی خۆی چڕ کردبۆوە بۆ کۆتایی هێنان بە هەژاری و ڕاگرتنی شەڕی ڤییێتنام. کینگ لە ٤ی نیسانی ١٩٦٨ لە مێمفیس، تێنێسی تیرۆر کرا.

# (جۆرج بێرنارد شۆ)

جۆرج بێرنارد شۆ (لە دایکبوونی ٢٦ی تەمووزی ١٨٥٦ – مردن ٢ی تشرینی دووەمی ١٩٥٠) نووسەرێکی شانۆیی ئێرلەندی و یەکێک لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی لەندەن بۆ ئابووری بوو. یەکێکە لە کەڵە ئەدەبیانی بەریتانیا و ئێرلەندا. یەکەم نووسینی پڕسوودی لە بارەی موزیک و ئەدەبی ڕەخنەیی بوو، بەهرە سەرەکیەکی لە بواری دراما بوو، زیاتر لە ٦٠ شانۆگەری نووسیەوە. چەندین پارچە نووسینی لەسەر بابەتی سۆشیالیستی و هەژاری و دادپەروەرێتی و ئایین و موزیک ئەوجۆرە بابەتانە نووسیوە. شۆ چەندین بواری

تاقیکردۆتەوە لەوانە پەروەردە و هاوسەرگیری و ئایین و حکومەت و تەندروستی. هەروەها شۆ ماوەیەک ئەندامی کۆمەڵەی فابی بوو و ماوەیەکی کورتیش ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگای لەندەن بوو. لە ساڵی ١٨٩٨ شۆ ژیانی هاوسەری لەگەڵ چارلۆت پەین-تاون شێد پێکهێنا، کە هاوڕێی بوو لە کۆمەڵەی فابی . هەردووکیان لە ئایۆت سانت لۆرێنس نیشتەجێ بوون، لە خانووێک کە ئێستا پێی دەگوترێت کۆڕنەی شۆو (بە ئینگلیزی (Shaw's corner)، شۆ هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی ٩٤ ساڵیددا. شۆ تاکە کەس کە توانیویەتی هەردوو خەڵاتی نۆبڵ لە ئەدەب و خەڵاتی ئۆسکار وەرگرێت، شایانی باسە خەڵاتی نۆبڵی لە بواری ئەدەب دا لە ساڵی ١٩٢٥ پێبەخشرا، شۆ ویستی خەڵاتەکە ڕەت بکاتەوە

بەڵام ژنەکەی قایلی کرد بەوەی وەریگرێت چونکە ئەمە دەبێتە ستایشێک بۆ ئیرلەندا.

## (ژان ژاک ڕوسۆ)

٢٨ی حوزەیرانی ١٧١٢ - ٢ی تەمموز ١٧٧٨) فەیلەسووف و نووسەر و داڕێژەری ڕۆمانتیسیزمی دەربڕینی فەڕەنسیی خەڵکی ژنێڤ بوو. فەلسەفە سیاسییەکەی کاری کردە سەر شۆڕشی فەڕەنسی، سیاسەتی هاوچەرخ، کۆمەڵناسی، هەروەها بیری

پەروەردەیی. لەژێنێڤ لە دایک بووە، باوکی ئیزاك رۆسۆ سەعاتچیەکی ناسراو بووە، دایکیشی (سوزان بێرنارد) ماوەیەك دوای لە دایك بوونی رۆسۆ دەمرێت، باوکی لایەنگرێکی بەبروای دەسەلاَتی کۆماری بوو دەیویست کورەکەیشی بەو شێوەیە پەروەردە بکات ،رۆسۆ لەتەمەنی پێنج ساڵیەوە دەستیکردوە بە کتێب خوێندنەوەو تاکۆتایی ژیانی، (پلوتارك) خۆشەویسترین نوسەر بووە لەلای، پاش بەسەربدنی چەندین ساڵ لەتەمەنی تاراوگەو گەڕان بە شارەکاندا؛ رۆسۆ خەریکی توێژینەوەی توانستەکانی خۆی دەبێت، سەرەتا بە فەلسەفە دەست پێدەکات، فەیلەسووفەکانی وەك (جۆن لۆك و مالێبرانژ و دیکارت و لایبنیتس و ڤۆڵتێر) دەخوێنێتەوە، ژیانی ئەم ساڵانەی رۆسۆ پڕە لەگەڕان بە نێو ئیتالیا و فەڕەنسا و سویسرادا.

رۆسۆ فەیلەسوفەکان بە بەشێکی ئەو جیەانە دادەنێ، کە رەخنەی لێدەگرن، بۆیە هەموویان گوناەباردەکات، بەوەی کە فەیلەسووفەکان گرنگی بە نەهێشتنەوەی دامەزراوەکانی چەوساندنەوە دەدەن و کاریان بۆ دەکەن، ژیانی رۆسۆ دوای بڵاوبوونەوەی "دیکسۆرزی زانست و هونەر" بەتەواوەتی دەگۆڕێت کە دەتوانرێت لەنێو "دیکسۆرزی زانست و هونەر" دا چەند بیرورایەکی رۆسۆ وەك (مرۆڤایەتی لە دۆخە بێگوناه و سەرەتاییەکەی ژێر پەریوە) و (ئەو نەتەوانەی لە رووی هونەری و زانستیەوە دواکەوتوون لە و نەتەوانە سەروەرتن کە پێشکەوتوون)دیاریبکرێن

# (ناپۆلیۆن بۆناپارت)

ناپۆلیۆن بۆناپارت (١٥ی ئاب ١٧٦٩ ـــ ٥ی ئایار ١٨٢١) سەردارێکی سەربازی و ڕامیاریی وڵاتی فەڕەنسا بوو کە بووە ئیمپراتووری فەڕەنسا بە نازناوی ناپۆلیۆنی یەکەم؛ کردەوەکای ئەم کەسایەتییە کاریگەری تەواوی هەبوو لەسەر هەلومەرجی سەدەی ١٩ی ئەوڕووپا.

ناپڵۆن لە کۆرسیکا لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگی ئیتاڵی لەدایک بوو. بە فەرەنسی لە دایک بووە چونکە فەرەنسا پێش لە دایکبوونی ئەم دوورگەیەی کڕیبوو . لەکاتی لاویدا بۆ کاربەدەستی لە تۆپخانەدا فێرکرا.

بۆناپارت شانازی دەکرد بە خزمەت بە یەکەمین کۆماری فەڕەنسی و بە سەرکەوتوویی توانی ڕابەریی لەشکرەکان بکات لە شەڕەکان لە سەردەمی لاویدا. ناپلیۆن لە فەرەنسا خوێندویەتی و لە بیرکاری و هونەری جەنگدا سەرکەوتووبووە بە پلەی مولازمی دووەم دەرچوو .

بیروباوەڕەکانی ( ژان ژاک رۆسۆ ) و شۆڕشی فەرەنسی کاری تێکردووە و هاوکاری لەگەڵ پارتی یەعقوبیەکان کردووە ڕەنگە ئەوەش بە هۆی حەزی خۆ دەرخستنەوەبوبێت نەک بڕواهێنان بە بیروباوەڕی شۆڕش و دڵسۆزی بۆ ڕاکان بوبێت . لە گەمارۆدانی ( تۆلۆن ) دا ناوبانگی دەرکرد . لە ساڵی ( ١٧٩٦ز ) دا لەگەڵ جۆزفینی بێوەرژنی یەکێک لە ئەفسەرەکانی سوپاس فەرەنسی هێنا و ئەویش یارمەتیدا لە

## ناسینی یەکێک لە سەرکردەکانی حکومەتی بەڕێوەبردندا .

لە ١٧٩٩ کودەتایەکی گەیاندە بەر و خۆی وەک یەکەمین کۆنسوول ناساند؛ پەنج ساڵ دوای ئەوە سەنای فەڕەنسا ئەوی وەک ئیمپڕاتووری فەڕەنسا ناساند. لە ١٠ساڵی دەستپێکی سەدەی ١٩، ئیمپراتوریی فەڕەنسا کەوتە ناو زنجیرە کێشەیەک بە ناوی شەڕە ناپلئۆنییەکان، کە هەموو زلهێزەکانی ئەورووپا تێکەڵ بە کێشەکە بوون. دوای زنجیرە سەرکەوتنێک لە شەڕەکاندا، ناپلۆن وازی هێنا لە شەڕ و هەوڵی دا ئاستی سەرەوەی فەڕەنسا لە ناوچەکە سەقامگیرکات؛ بە پێوەندی نزیککردنەوەی سەرۆکی وڵاتانی دیکە یا دانانی خزم و کەسی خۆی وەک نوێنەری فەڕەنسا لەو وڵاتانەدا.

هێرشی فەڕەنسا بۆ سەر ڕووسیا لە ١٨١٢دا، وەک خاڵی گەڕانەوە دەزانن لە داهاتووی ناپلۆندا. لەشکرە گەورە و بەناوبانگەکەی لە درێژەی ئەم شەڕەدا تێکچوو و قەت وەک خۆی لێنەهاتەوە. لە ١٨١٣ هاوپەیمانیی شەش لایەنە، هێزەکانی ناپۆلیۆنی شکەستدا و هەر لەو ساڵەدا ئەم هاوپەیمانییە هێرشی کردە سەر فەڕەنسا و وایکرد ناپلۆن وڵات جێ بهێڵێت و خۆی لە دوورە وڵات دانیشتووی دوورگەی ئێلبا بێت. کەمتر لە ساڵێک دوای ئەوە ئێلبای بەجێهێشت و گەڕاوە سەر دەسەلات، بەڵام لە حوزەیرانی ١٨١٥دا لە واترلۆ شکەستی هێنا. ناپلۆن دوایین شەش ساڵی تەمەنی لە بەندی بەڕیتانیدا لە دوورگەی سەینت هێلێنادا ڕابوارد. دوای مردن و کۆڵینەوەی لەشی، دوکتۆرەکان دەریان خستووە کە شێرپەنجەی

گەدە هۆی مردن بووە، هێندێکیش دەڵێن ژەهری ئارسەنیکی پێدراوە.

## (ویلیام شێکسپیر)

ویلیام شێکسپیر (٢٦ی نیسانی ١٥٦٤ - ٢٣ی نیسانی ١٦١٦)، هۆنراوەنووس و شانۆنووسێکی ئینگلیز بوو. بەشێوەیەکی بەرفراوان بە گەورەترین نووسەرەکانی زمانی ئینگلیزیی دادەنرێت، هەروەها دیارترین نووسەرەکانی دراما لە جیهاندا. زۆرین جار نازناوی (هۆنراوەنووسی ئینگلتەرای نەتەوەیی) و (هۆنراوەنووسی ئافۆنی داستانیی) لێدەنرێت. کارەکانی

زیندوون، پێک دێن لە ٣٨ شانۆگەریی، ١٥٤ سۆناتا و دوو هۆنراوەی گێرانەوەی دووردرێژ، هەروەها ژمارەیەکی تر لە هۆنراوە. شانۆگەرییەکانی بۆ هەموو زمانە زیندووە سەرەکییەکانی جیهان وەرگێراون، و لەهەر شانۆگەرییەکی تر زۆرتر پێشکەش دەکرێن. شێکسپیر لەدایکبووە و گەورە بووە لە ستراتفۆرد ئابۆن ئافۆن، لەتەمەنی ١٨ ساڵییدا چۆتە ژیانی هاوسەرییەتییەوە لەگەڵ ئان هاساوای، کە ٣ منداڵی لێی بوو، سوزانا و دووانەیەک کە هامینت و جۆدێس بوون. لەنێوان ساڵەکانی ١٥٨٥ بۆ ١٥٩٢ دەستی کرد بە پیشەیەکی سەرکەوتوو لە لەندەن وەک ئەکتەر و نووسەر، و بەشێک بوو لە خاوەنی کۆمپانیای نواندن کە ناوی پیاوانی لۆرد چامبرلین بوو، کە دواتر بە ناوی پیاوانی پادشا ناسرا. دەردەکەوێت کە خانەنشین بووە و گەڕاوەتەوە بۆ ستراتفۆرد

**لەدەوروبەری ساڵی ١٦١٣، کە دوای سێ ساڵ پاش ئەو کۆچی دوایی کرد.**
**تۆمارنامەیەکی کەم ماوە لەژیانی تایبەتیی شێکسپیر.**

**شێکسپیر کارە هەرە گەورە و ناسراوەکانی لەنێوان ساڵانی ١٥٨٩ بۆ ١٦١٣ بەرهەم هێناوە، بەشێوەیەک کە شانۆگەرییەکانی سەرەتای بەشێوەیەکی گشتیی کۆمیدی و مێژووی، ئەمانەش شێوازێک بوون کە گەیانییانە رادەی ئاڵۆزبوون و ئاستی باڵا لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەهەم. پاشان هەستا بە نووسینی تراژیدی بەشێوەیە گشتی تا نزیکەی ساڵ ١٦٠٨ ـیش، لەوانە هاملێت، پادشا لیرو ماکبێس، کە ئەم کارانە بە باشترین کارەکانی زمانی ئینگلیزیی دادەنرێت، و لە کۆتاییەکانیشدا هەستا بەنووسین بەشێوەی کۆمیدیای تراژیدی، بەناوی رۆمانسیات ـیش، هەروەها هاوکاری و**

یارمەتی هەبووە لەگەڵ شانۆنووسانی تر. زۆرێک لە شانۆگەرییەکانی لەماوەی ژیانییدا لەبەرگی جۆروجۆردا دەرچوون و لەچاپ دراون بەشێوەیەکی کوالیتیی بەرز. لەساڵی ١٦٢٣، دوو هاوڕێ/هاوکار ی کۆنی شانۆی هەستان بە بڵاوکردنەوەی پەڕەی یەکەم بۆی، ئەمەش چاپێک بوو کۆکرابووەوە بۆ کارە دراماتیکییەکان بەشێوەیەک کە هەمووی گرتەوە جگە لەو دوو شانۆگەرییەی کە ئێستا دەزانرێت کە هی شێکسپیر بوون. شێکسپیر هۆنراوەنووس و شانۆنووسێکی ریزداری سەردەم و رۆژانی خۆی بوو، بەڵام قورسییەتی بەرزنەبووە و ئەم ژیانەوەیەی ئێستای بۆخۆوە نەدیت تا سەدەی نۆزدە، بەشێوەیەک کە رۆمانتیکییەکان ئەوپەڕی لێهاتوویی و زانایی شێکسپیرییان بینی، وەک چۆن کە ڤیکتۆرییەکان بە پەرستن ئازایەتی شێکسپیرییان ئەپەرست گەیشتە ئەو رادەیەی

که جۆرج بێرنارد شۆ وتی شێکسپیر (بتی هۆنراوەنووسانی داستان)) ـە (Bardolatry) لەسەدەی بیستەمدا.
ئێستاش شانۆگەرییەکانی خاوەنی زۆرترین جەماوەرە و لەوپەڕیی ناوبانگدایە بەشێوەیەکی بەردەوامیش لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت، هەروەها دووبارە نمایشکردنییان و دووبارە لێکدانەوەیان لەسەکۆ جیاوازە رۆشنبیریی و سیاسییەکان لەسەرانسەری جیهان.

## سەرەتاکانی ژیانی

ویلیام شێکسپیر کوڕی جۆن شێکسپیر بوو، درووستکەرێکی زۆر سەرکەوتوو بوو لە بواری درووستکردنی دەستکێشدا، و ئەندامی شارەوانیش بوو، رەگەز و بنەڕەتی ئەگەڕێتەوە بۆ سنێترفێڵد، دایکیشی ماری شێکسپیر، کچی دەوڵەمەندێک بوو کۆمەڵێکی زۆر زەوی هەبوو. شێکسپیر لە ستراردفورد

ئابۆن ئافۆن و وا دانراوە کە لە ٢٦ ی
نیسانی ١٥٦٤ لەدایکبووە، بەرواری
لەدایکبوونی راستەقینە و دڵنیایی شێکسپیر
تائێستا نەناسراوە، و سێیەم منداڵ بووە لەنێو
هەشت منداڵدا. لەگەڵ نەبوونی هیچ
تۆمارنامەیەکی زیندوو بۆ ئەو ماوەیە، بەڵام
زۆربەی پەڕتووکەکانی ژیاننامە کۆکن لەسەر
ئەوەی کە شێکسپیر لە قوتابخانەی پادشای
نوێ لە ستراوفۆرد فێری خوێندن بووە،
ئەویش قوتابخانەیەکی ئازاد بووە، لەساڵی
١٥٥٣ بەکرێگیراوە کە دووریەکەی چارەکە
میلێک دەبوو لە ماڵەکەیەوە، خوێندنگەکانی
رێزمانی زمان جیاواز بوو لەڕووی ئاستەوە
لەسەردەمی ئێلێزابێسدا، بەڵام مەنهەجەکە
دەنووسرایەوە بەپێی یاسا لەسەرانسەری
ئینگلتەرادا، بەوشێوەیەش خوێندنگە
فێربوون و خوێندنێکی ڕاست و بەهێزی
دابین دەکرد لە رێزمانی زمانی لاتینی و

کلاسیکێتی. لەتەمەنی ١٨ ساڵیدا، لەگەڵ ئان هاساوای چوونە ژیانی هاوسەرێتییەوە کە لەوکاتەدا ئان ٢٦ ساڵ بوو، دادگای کەنیسە لەوکاتەدا مۆڵەتی هاوسەرگیریی لە ٢٧ ی تشرینی دووەمی ١٥٨٢ دا دەرچووان. پاش ئەوەی بە چەند رۆژێک دوو هاوسێ/دراوسێی ئان بەڵگەنامەیان دا کە هیچ رێگریی و تەگەرەیەک نییە لەبەردەم هاوسەرگیرییەکەیان. پێدەچێت هەردوو هاوسەر لەو کاتەدا بەپەلە هاوسەرگیرییەکەیان رێکخستبێت، چوونکە راوێژکار و ڕسستەر رێگەی دا بەخوێندنەوەی هاوسەرگیرییەکە بۆ تەنها جارێک لەبری سێ جار خوێندنەوەی بنەڕەت. رەنگە سکپڕیی ئان لەوکاتەدا هۆکار بووبێت بۆ ئەو پەلە پەلە، پاش شەش مانگ لە هاوسەرێتی منداڵێکییان بوو کە سوزانا بوو، کەدانراوە بە لەدایکبووی ٢٦ ی مایس ی

١٥٨٣. بەدوای ئەودا دووانەیەکییان بوو کە کوڕێک بەناوی هامنێت و کچێک بەناوی جودێس بوو ئەمەش لە پاش دوو ساڵ. هەروەها ئەوانیش بە لەدایکبووی ٢ ی شوباتی ١٥٨٥ دانراون، بەڵام هامنت کۆچی دوایی کرد بەهۆی چەند هۆیەکی نەزانراوەوە لەتەمەنی ١١ ساڵیدا، و نێژراوە لە ١١ی ئاب ی ١٥٩٦. پاش لەدایکبوونی دوانەکە، بۆ لەچەند شوێنپێیەکی کەمی شێکسپیر هیچی تر نەبوو لەسەر مێژووی، تەنانەت وەک بەشێک لە بینراوەکانی شانۆگەرییەک لە لەندەن ساڵی ١٥٩٢ باسکرا. و بەهۆی ئەم بۆشاییەوە، لێکۆڵەرەوان ئاماژە بەوە دەدەن کە ساڵەکانی نێوان ١٥٨٥ و ١٥٩٢ -ساڵە لەناوچووەکانی شێکسپیرن-. لەهەوڵی نووسینی ژیاننامە بۆ شێکسپیر لەم ماوەیەدا، سوود وەرگیرا لە بەسەرهاتە بۆ هەڵبەستراوەکان. نیکۆڵاس ڕۆ یەکەم

ژیاننامەی شێکسپیری نووسیوە و ئەو ئەفسانەیەی ستراتفۆردی نوێکردۆتەوە کە دەڵێت لە شێکسپیر هەڵهاتووە لە دادگا بەهۆی کەیسی ڕاوکردنی نایاسایی ئاسک. جۆن ئۆبری ئاماژەی بەوەدا کە شێکسپیر بەڕێوەبەری قوتابخانەیەکی دەرشار/لادێ بووە. هەندێک لە زانایانی سەدەی بیستەم پێشنیاری ئەوە دەکەن کە شێکسپیر رەنگە وەک بەڕێوەبەری قوتابخانەیەک دانرا بێت لەڕێگەی هوگتۆن لە لانکشایرەوە، کە خاوەنی زەوییە کاسۆلۆکییەکان بووە، و لە وەسیەتنامەکەیدا ناوبراو [ویلیام شیکشافت] ی دیاریکردووە. و هیچ بەڵگەیەکیش نین لەسەر ئەمانە و هەم لەسەر ئەو هەڵبەستر و قسەڵۆکانەی دوای مردنی درووست بوون.

## کۆتا ساڵەکان و کۆچی دوایی

ڕۆو یەکەم نووسەرەوەی ژیاننامەی شێکسپیر بوو، ئاماژە بەوە دەکات کە

شێکسپیر خانەنشین کراوە بۆ ستراردفۆرد پێی کۆچی دوایی بەچەند ساڵێک، بەڵام خانەنشینیی لەهەموو کارەکانی ژیان لەو سەردەمەدا شتێکنی پێناسەنەکراوبوو، و شێکسپیر بەردەوام بوو لەسەردانکردنی بۆ لەندەن، لەساڵی ١٦١٢ داواکرا بۆ گەواهیدان لە داوایەکی یاساییدا سەبارەت بە راپەراندنی هاوسەرێتی کچی ماونت جوی، بەناوی ماری. لە مانگی ئازار ی ١٦١٣ هەڵستا بە کڕینی واڵامالَ لە دێر، بلاکفریزری پێشوو، پاشان لە لەندەن بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک مایەوە لەگەڵ هاوسەری کچەکەیدا، کە ناوی جۆن هۆل بوو، لە تشرینی دووەمی ١٦١٤.

لەدوای ١٦٠٦-١٦٠٧، شێکسپیر ژمارەیەکی کەمتری لە شانۆگەریی نووسیی، وهیچیشییان نەگێردرانەوە بۆی لەدوا ١٦١٣. دوایین سێ شانۆگەریی پاڵپشتیی کرد لەگەڵ جۆن فلێچر، کە جێنشینی کرد وەک شانۆنووسێکی تایبەت

به پیاوانی شاهـ. شێکسپیر، لە ٢٣ ی نیسانی ١٦١٦ دا کۆچی دوایی کرد، لەدوای خۆی ژنەکەی و دوو کچەکەی بەجێهێشت، سوزانا شوویکرد بە پزیشکێک لەساڵی ١٦٠٧، کە ناوی جۆن هۆل بوو، هەروەها جۆدیس ـیش شوویکرد بە تۆماس کوینی کە بازرگانی خواردنەوەی کهولیی بوو، ئەمەش بەدوو مانگ پێش کۆچی دوایی شێکسپیر.

لە وەسییەتنامەکەیدا، شێکسپیر بەشی گەورەی سامانەکەی بەجێهێشت بۆ کچە گەورەکەی، سوزانا. و رێنماییەکان وابوو کە تێپەڕبێت تا دەگاتە "یەکەم منداڵ لە جەستەی"، خێزانی کوینیی سێ منداڵییان بوو، هەرسێکییان بەبێ چوونە ناو ژیانی هاوسەرییەتییەوە مردن. بەڵام خێزانی هۆل، یەک منداڵییان بوو کە ئێلیزابێس بوو، کە دوو جار شوویکرد بەڵام لەهیچ جارێکییاندا منداڵی نەبوو، پاشان مردووە لەساڵی ١٦٧٠، کە

کۆتا کەس بوو لە رەچەڵەکی راستەوخۆی شێکسپیر. وەسییەتنامەکەی شێکسپیر زۆر بەکەمی باسی ئانی ژنی تێدا بوو، کە دەبوو خۆکارانە سێ یەکی سامانەکەی بەربکەوتبا. بەڵام خاڵێک هەیە لێرەدا سەلێمێنرا، ئەویش بەجێهێشتنی "باشترین دووەم سیسەمی نووستن لام"، ئەمەش بەجێهێڵدراوێک بوو کە زۆر جێی قەبڵاندن بوو. و زۆرێک لەزانایان ئەم بەجێهێڵدراوە وەک سوکایەتییەک بۆ ئان دادەنێن، و هەندێکی تر لەهەمان کاتدا وای دادەنێنی کە "باشترین دووەم سیسەمی نووستن" دەبێ سیسەمی هاوسەرێتی بێت. شێکسپیر نێژراوە لە بەندەییگە لە کەنیسەی سالۆسی پیرۆز، پاش دوو رۆژ لە مردنی، لەسەر کێلی گۆڕەکەی نووسراوێک هەڵکەندراوە کە نەعلەت دەکات دژ لەجووڵاندنی ئێسکی شێکسپیر:

**Good frend for Iesvs sake forbeare, To digg the dvst encloased heare. Blest be ye man yt spares thes stones,**

**پاش ماوەیەک لەدوای ١٦٢٣، ڕێورەسمی ناشتنی یادەوریی بۆ کرا، لەگەڵ پەیکەرێکی نیوەیی، ئەو پەیکەرە جیاوازی شێکسپیر درووست دەکات لەگەڵ نستیۆر، سۆکرات و فێرجیل.**

## (لیۆ تۆلستۆی)

**لیۆ تۆڵستۆی یا کۆنت لیێڤ نیکۆلاییڤیچ تۆلستۆی (لەدایکبووی ٩ی ئەیلوولی ١٨٢٨ - مردن تشرینی دووەمی ١٩١٠) نووسەری**

ناوداری ڕووسیایە کە بە نووسەرێکی سەرکەوتوو لە سەرانسەر دونیادا ناسراوە.
شاکارەکانی شەڕ و ئاشتی و ئانا کارێنینا، پێناسەی ڕۆشن ئەدەن بە دەستەوە لە ڕۆژگار و بارودۆخی ڕووسیای سەدەی ١٩ و هەروەها وەک لووتکەی چیرۆکە ڕاستییەکان دەناسرێن.

ژیانیلیۆنکۆی لایویچ تۆڵستۆی لە ٩ی سێپتێمبەری ساڵی ١٨٢٨ لە گوندی یاسنا یاپا لیناغ هەڵکەوتوو لەشاری تولا لەداین بوو.ناوبراو شارەزای زمانەکانی ئینگلیزی ،فەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتاڵی بوو.هەرلەمنداڵیەوەو دایک و باوکی مردن و بەرهێناتنەکەی کەوتە دەست یەکێک لەخزمەکانی . لە سالی ١٨٤٤ چووە زانکۆی غازان و لەسالی ١٨٤٧ بەر لەوە کە خوێندنەکەی تەواو بکات ، وازی لێهێناو گەرایەوە شوێنی لەدایک بوونەکەی و

زۆربەی کاتەکانی خۆی تەرخانی خوێندنەوە کرد . لەسالی ١٨٥٢ دا لەسەر داخوازی خۆی چوو بۆ قەفقاز ولەشەرەکانی ئەو ناوچەیەدا بەژداری کرد . تۆڵستۆی چیرۆکەکانی سەردەمی منداڵی ، سەردەمی لاوێەتی و هێندێک لە چیرۆکەکانی دیکەشی سەبارەت بە روداوەکانی شەری قەفقازنوسیپەوەو لە هەر لەوێش دەستیکرد بە نوسینی چیرۆکی قەزاقەکان هەر لەو ساڵەدا شاعیرێکی ناوداری ڕووسیا چیرۆکی منداڵیەکەی لەگۆڤاری "سەردەم" دا بلاو کردەوە .بڵاوکردنەوەی ئەو چیرۆکە بوەهۆی ئەوەی کە تۆڵستۆی ناوبانگ دەربکات و چیرۆکەکانی دواتریش ئەو نێوبانگەی ئەویان داسەپاند . ئەو دوای گەرانەوەی راگوێزی سوپا کراو بۆ بەرگریکردن لە سواستۆپۆڵ چوو کریمە و ئاخوداخی خۆی سەبارەت بە

## گەمارۆدانی سواستۆپل لەسێ چیرۆکدا بەناوی حەکایەتی سواستۆپۆل نووسی.

دوای گیرانی شار چوو بۆ پێتێرزبورگ و لەوێ لەگەڵ نوسەرانی گەورەیی ئەوکاتی ڕووسیا ئاشنا بوو . ناوبراو لەکۆتایی سالی ١٨٥٦ دا وازی لە خزمەتی سوپا هێناو دوای دومانگ چوو بۆ وڵاتانی فەڕەنسا و سویسرا و ئیتالیا . لەسالی ١٨٥٩ دا لە شوێنی لەدایک بونەکەی خوێندنگەیەکی بۆ فێرکردنوو بارهێنانی گوند نشینەکان دامەزراند . لەسالی ١٨٦٩ دا دیسانەوە هاورێ لەگەڵ خوشکەکەی بەرەو ناوەندی ئەوروپا چوو. لەو سەفەرەدا زیاتر خۆی بە بارودۆخی فێرکردنوو بار هێنان لەخوێندنگاکانی فەڕەنسا و سویسرا و ئیتالیا و نەمسا بەریتانیاوە خەریک کرد.

لەسێپتێمبەری ١٨٦٣ دا لەگەڵ "سۆفیا
ئەندەر یونا" هاوسەرگیری کرد . ناوبراو
لەکۆتایی هەرئەوسالەدا دەستیدایە نوسینی
گەورەترین بەرهەمی ئەدەبی خۆی . بەناوی
"شەرو ئاشتی" لە سێپتێمبەری ١٨٨١ دا
لەگەڵ بنەماڵەکەی چوو بۆ مۆسکۆ خەریکی
فێرکردن و راهێنانی لاوان بوو. لەداین
سالەکانی ژیانیدا بەهەولێکی ماندووی
نەناسنە کاری دەکرد و سەرەرای ئەو
نەخۆشیەی کە لە سالی ١٩٠١ ەوە تووشی
ببوو، دەرونێکی سەلامەتی هەبوو تۆڵستۆی
لە ٧ ی نۆڤەمبەری سالی ١٩١٠مال ئاوایی
لەژیان کرد.

تۆڵستۆی دەیویست پەیڕەوی عیسا بکات و
ژیانی ڕەبەنی قەشە خۆبەختکەرەکان بژی
لەکاتی پیریدا هەموو موڵک و زەوی و زاری.

خۆی بەسەر جوتیارە هەژارەکاندا دابەش کرد . ناودارترین ڕۆمانەکانی ( شەڕ و ئاشتی ) و ( ئانا کارنینا ) یە . یەکەمین بەشی لەمێژووی ژیانی خۆی بەناوی ( ساوایی ) لەساڵی ١٨٥٢ بڵاوکردەوە بەرگی دووەمی لەساڵی ١٨٥٤ دا بەناوی ( سەردەمی منداڵی ) و بەرگی سێیەمیشی لەساڵی ١٨٥٧ بەناوی ( لاویی ) بڵاوکردەوە . لەساڵی ١٨٧٩ کتێبی ( دان پێداهێنان ) ی دانا و لەساڵی ١٨٨١ ( خستنە ڕوویەکی تێکڕای کتێبی پیرۆز ) ی نوسی و لەساڵی ١٨٨٢ کتێبی ( یاسای خۆشەویستی و یاسای هێز ) ی بڵاوکردەوە و لە ساڵی ( ١٨٨٩ ــ ١٩٠٠ ) دا ڕۆمانی ( ژیانەوە ) ی دانا و لەساڵی ١٩٠١ شانۆگەری ( لاشەی زیندوو )ی دانا و ، بەڕای ڕەخنەگرانی جیهانی تۆلْستۆی بە گەورەترین نوسەری دنیا دادەنرێت و دیسان مەزنترین پیاوچاکیش بووە لە گێتی دا وزۆر کەسی

**چاکە خواز سەردانیان کردوە و سوودیان لە بیروباوەڕی چاکە خوازی وەرگرتووە ، یەکێک لەوانە مەهاتما گاندی ( ١٨٦٩ – ١٩٤٨ ) پێشەوای گیانی و نیشتیمانی هیندستان بووە چووەتە سەردانی و گەلێک لە بیر و باوەڕی ئاشتی خوازە ئینسانیيەکانی وەرگرتووە و لە وڵاتەکەی خۆیدا بەکاری هێناوە . تۆڵستۆی لەساڵی ١٨٦٢ کچێکی هێنا ناوی ( یۆفیا ئەندریغنا ) بوو ، ١٥ ساڵ لەگەڵیدا لە یەکێک لە جاندنگە گەورەکانیدا بەخۆشی ژیا و گەلێک منداڵی لێی بوو ، بەڵام ئەو خۆشی و بەختەوەریەی تاسەر نەبوون و ژنەکەی لە دابەشکردنی زەوی و زاریدا بەسەر جوتیاراندا لەگەڵیدا ناکۆک بوو ، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ لە یەکتر دوور دەکەوتنەوە تا وایان لێهات حەز بە دیدەنی یەکتری نەکەن و تەنانەت تۆڵستۆی وەسیەتی کرد لەکاتی**

# مردنیدا ماوەی نەدرێ ژنەکەی بێتە سەر گۆڕەکەی .

بەرهەمەکانی تۆڵستۆی زۆر بەدڵی خەڵکەکە بوون ، بۆیە لەماوەی تەنیا ٤ساڵیدا ١٢ ملیۆن دانە لە کتێبەکانی فرۆشران و بەزۆریش لەقاڵبی چاپی سادە و میللی دا چاپ دەکران تاکو هەرزان بفرۆشرێن و بە گاڵیسکە بەسەر خەڵکە خوێندەوارەکاندا دابەش بکرێن . لەڕاستیدا وەک خەڵکەکە لە بەرهەمەکانی تۆڵستۆی قایل بوون و دڵنیابوون ئەوەندە خۆی لەژیانی خێزانی خۆی ناقایل و لە ئازار و ئەشکەنجەدا بوو .لەو هەموو خێزان و منداڵانەی تەنها کچی بچوکی پشتگیری بوو ، سکرتێری ئەدەبی و کاروباری تایبەتی بوو ، ئەو کچە دڵسۆزەی لەدوای مردنی باوکی ئەمەی لەبارەیەوە نوسیوە .

( باوکم ژیانەکەی کارەساتێکی تەواو بوو ئەو کارەساتەیشی لەژن هێنانەکەیدا بوو ، دەق وەک مەسەلەی ( ئەبراهام لەنکۆلن ) و ژنهێنانەکەی بوو ! لێی بوبوە دەرد و بەڵا بەسەریەوە ، چونکە ژنەکەی پارە و سامان و خۆشگوزەرانی گەرەک بوو ، کەچی تۆلستۆی باوک حەزی پێنەدەکردن و بە دوو شتی کەم نرخی دادەنان و ژنەکەی حەزی دەکرد بەهۆی سامانی دنیا ناوبانگ دەربکات ، کەچی ئەم نەیدەویست بەپارە شۆرەت پەیدا بکات ، بەڵکو وەک گوناهێک سەیری ماڵ و سامانی دنیای دەکرد و ، دەیگوت گەورەیی و دەسەڵات بەهێز و دەست وەشاندن نایەنە دەست ، بەڵکو بە خۆشەویستی و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی چنگ دەکەون .
هەرکاتێک کە ژنەکەی دەیزانی کە تۆڵستۆی کتێبێکی بڵاوکردۆتەوە و هیچ حەقێک لە

بڵاوکەرەوەی وەرنەگرتووە بەجارێک
هەڵدەچوو و ماڵەکەی لێ دەکردە دۆزەخ ،
بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ ژیانی هاوسەریانی تێکچوو
و ماڵەکەی بەجێهێشت و چوو لەگەڵ
بچوکترین کچی لە ژوورێکی ئێستگەی
شەمەندەفەر ژیا و زۆری پێنەچوو لەساڵی
١٩١٠ دا لەو شوێنە تەسک و تروسکەدا
کۆچی دوایی کرد و گەورەترین ناوبانگی
لەدوای بەجێما . چیرۆکی ژیانی ئەم نوسەرە
بلیمەتە ناودارەی ڕوس گەلێک سەیرترە لە
حیکایەتەکانی داستانی هەزار و یەک شەوەی
ڕۆژهەڵات و بیست ساڵی دوایی لەژیانیدا ،
ئەوەندە ناوبانگی چاکە و گەورەیی بڵاوبوەوە
، گەیشتە ڕادەیەک بپەرسترێ و ملیۆنەها
کەس حەزیان دەکرد چاویان پێی بکەوێ و
لەگەڵیدا دانیشن و سوود لەبیروباوەڕەکانی
وەرگرن . خەڵکێکی زۆر لەنوسەر و
ڕەخنەگران دەچوونە لای تاکو گوێ

لەئامۆژگاریەکانی ڕابگرن و دەست لە لچکی جلوبەرگی بدەن ، تاکو لە نزیکەوە تێی بگەن و بیناسن و چەندان لێکۆڵینەوەی لەسەر بنوسن . نوسەرە دۆستەکانی چەندەها ساڵ و ڕۆژ لەماڵەکەی دەمانەوە تاکو بە کورتی چەند جوڵە و وشەیەکی لەدەم دێتەدەرەوە تۆماری بکەن . لەدوایدا بە دوور و درێژی لێیان بکۆڵنەوە . زۆر جاری وابووە نوسەر و ڕەخنەگری بەتوانا ئەو زانیاریانەی لەچەند ساتێکدا لێیان وەرگرتووە لەدوایدا کراون بەبەرگی گەورەی کتێب و لێکۆڵینەوەی بەپێز و تێر و تەسەل و پەیتا پەیتا لە گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێبدا بڵاوکراونەتەوە و نوسەرانی جیهان بەگەرمی قۆستویانەتەوە . ئەو کتێبانەی کەلەسەر لیۆ تۆڵستۆی مەزن نوسراون لەهەموو لایەکی جیهان گەیشتووەتە ٢٣ هەزار کتێب و لێکۆڵینەوە و ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە لێیەوە دواون و

بیروڕاکانیان شی کردۆتەوە ، گەیشتونەتە ٥٦ هەزار گۆڤار و ڕۆژنامە و ئەو کەلەپورە ئەدەبی و ڕۆشنبیریانەی کە بۆ مرۆڤایەتی بەجێیهێشتوون گەیشتووەتە ١٠٠ هەزار بەرگی گەورە و گران .

(کارڵ مارکس)

کارڵ هێنڕیش مارکس (١٨١٨-١٨٨٣)خاوەن بیر، فەیلەسووف، مێژوووناس، کۆمەڵناس، ئابووریزانی ئەڵمانی و یەکێک لە کاریگەرترین خاوەن بیرەکان لە سەرانسەر

دونیادایە. نووسەری کتێبی "سەرمایە" گرینگترین کتێبی بزووتنەوەی سۆسیالیستی بووە و بە هاوکاری فرێدریش ئەنگەڵس تێزی مانیفێستی کۆمۆنیست، مێژوویی‌ترین نووسراوی بزووتنەوە سۆسیالیستیەکانیان نووسی

لە ساڵی ١٨٤١دا و بە پێشکەش‌کردنی ئامیلکەی دوکتوراکەی سەبارەت بە جیاوازی دوو "فەلسەفەی یۆنانی" خوێندنەکانی زانکۆی کۆتایی هێنا. لەو کات و ساتەدا بیرۆکەکانی هێگێل لە مێشکیدا بوون، خۆی بە هێگڵی دەزانی و ڕوانگە ماتێریالیستی و دژە ئایینەکانی ئەو سەردەمەی ئاڵمانیای پەسەند ئەکرد.

دواتر پێکەوە لەگەل فرێدریش ئەنگەڵس دەستیان بە کار کرد، پەیوەندی لەگەڵ چوارچێوی بیر و ڕا گۆڕینەوەی زانکۆکانی

ئاڵمانیا پچران و لە بزووتنەوە کرێکاریەکانی ئورووپا بەشدار بوو.

ساڵانی کۆتایی ژینی کە زیاتر لە ٣٠ ساڵ بوو، بە دوور خستنەوە لە وڵات، لە لەندەن ڕابرد و هەر لەوێشدا چاوی نایە یەک. بیر و ڕاکانی تەنانەت لە سەردەمی خۆی پاڵپشتی زۆری هەبوو بەڵام دوای خۆی و هاتنە سەرەوەی بۆلشێڤیکەکان لە ڕووسیا، مارکسیزم و کۆمۆنیزم لە دونیادا پەڕەی سەند.

ئەگەرچی زۆرێک لە کەسایەتیەکان و بزووتنەوەکان خۆیان بە مارکسیست دەزانن بەڵام ڕوون نیە جیایی ئەوان لەگەڵ مارکسیزمی ڕاستی چۆنە. جارێک مارکس بۆ نیشان دانی نارەزایەتی بەوانەی ناوی خۆیان

ماركسيست ناوه وتى: هەر باشە ئەزانم كە بۆخۆم ماركسيست نيم.

لە سالّى ٢٠٠٥دا بى بى سى دەستى كرد بە ڕاخوازييێک كە ٢ مليۆن كەس بەشدار بوون تێيدا، ماركس وەک كاريگەرترين كەس لە سەر بيرى گشتى لە هەزارەى دووهەمى زايينى ناسرا. دواى ئەو ئەلبەرت ئاينشتاين و ئيساک نيوتۆن پلەى دووهەم و سێهەم هاتنەوە.

" مێژووى كۆمەڵەكان، سەرانسەر خەباتى چينايەتيە"" گرينگترين ڕەستەى مانيفێستى كۆمۆنيستە.

پاش بەرپابوونى شۆرش لە هەريەک لە فەڕانسە و ئاڵمانيا، حكوومەتى بەلجيكا ترسا

شۆرش ئەو وڵاتیش بگرێتەوە، بۆیە کارڵ ماركسی دووره وڵات کرد.

سەرەتا کارڵ مارکس چوو بۆ پاریس، پاشان ڕووی کردە کۆلۆنیا، هەر لەوێش ڕۆژنامەیەکی دامەزراند بەناوی " Neue Rheinishe Zeitung"، وە دەستی بەکاری شۆرشگێری کرد. لە ساڵی ١٨٤٩ دەستگیردەکرێ و دادگایی دەکرێ بە تۆمەتی هاندان بۆ یاخیبوونی سەربازی. پاشان تۆمەتەکەی لەسەر لادەبرێت و دوور دەخرێتەوە بۆ ئەلمانیا.

لە ساڵی ١٨٥٢ کە دەستەی شیوعییەکان هەڵوەشێندرایەوە مارکس بەردەوام بوو لە پەیوەندی بە سەدان شۆرشخوازەوە بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی نوێ. ئەم هەوڵانەش بووە هۆی پێکهێنانی ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی.

# (مەهاتما گاندی)

**موهانداس کەرمچاند گاندی (ماوەی ژیان: ٢ی تشترینی یەکەمی ١٨٦٩ تاکوو ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨) لە ٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٦٩ لە (بور بەندەر)لە ناوچەی (گاجارات)ی هیندستان لە خێزانێکی پارێزەر کە باکگراوندێکی سیاسی دوورودرێژیان هەیە لە دایک بووە،لە رابردوودا باپیری و پاشانیش باوکی سەرۆک**

وەزیرانی ناوچەی (بور بەندەر)بوون. وەک
لاوە هاوتەمەنەکانی خۆی لەوڵاتەکەیدا زوو
چۆتە بنباری ژنهێنان و لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا
ژنی هێناوەو چوار منداڵی لەو خێزانەی
هەبووە.لەساڵی ١٨٨٨ بۆخوێندنی یاسا چۆتە
لەندەن ولەسەرەتادا ویستویەتی وەکو
هەرگەنجێکە رۆژهەڵاتی کە چووبێتە رۆژئاوا
ژیانبەسەر بەرێت،بەڵام هەرزوو بەڵانسی
خۆی وەرگرتۆتەوەوپەیوەست بۆتەوە بە
خوێندن و ئاینەکەیەوەو بەردەوام لە هەوڵی
زیاتر خۆرۆشنبیریکردندا بووە. ئەو کەسێک
بووە کە پشتی بە خوراکی گیایی بەستووەو
کۆمەڵەیەکیشی لەوپێناوەدا دامەزراندبوو.
وەختێک خوێندنی یاسای تەواوکردوو لەساڵی
١٨٩١ گەڕایەوە هیندستان هەستیکرد کە
لەکاری پارێزەریدا ناگاتە ئامانج ولەگەڵ
ویستی ویدا یەکناکاتەوە، رێگایەک نیە بۆ
سەرکەوتن ،بۆیە دەمێک کاری

عەریزەنووسی دەکات ،پاشان بەگرێبەستێک بۆ ماوەی یەک ساڵ لەگەڵ کۆمپانیایەکی هیندیروو دەکاتە (ناتال)لەباشووری ئەفریقیا بۆ کارکردن. لێرەوە بە سەرەتاکانی تێکۆشانی ناتوندوتیژی ئاشنا دەبێت.

## گاندی وهاوسەرەکەی

ساڵی ١٨٩٣ گاندی وخێزانەکەی چوونە ناوچەی ناتال لە باشوری ئەفریقیا و دەستیبەکارەکانی کرد،لەوێدا ئاشنابوو بە ململانێی و تێکۆشانی ناتوندوتیژی.ناوچەکەی ئەو شوێنێکی کرێکاری بازرگانی بوو .کرێکاران دابەشببوون بەسەر سێ بەشدا: بەشێکیان عەرەبی موسڵمان بوون ،بەشێکی دیکەیان هندۆس بوون .سێیەمیشیان مەسیحی بوون،لەنێوانیشیاندا پەیوەندییەکی کەم هەبوو. هەر لەوێدا گاندی ئاشنابوو بەسیاسەتی رەگەزپەرستی حکومەتی باشووری ئەفریقیا کە ئەوکات هندستان

وباشووری ئەفریقیا لەژێر دەسەڵاتی
بەریتانییەکاندابوون. ئەو بەوە ئاشنابوو کە
حکومەتی رەگەزپەرتی باشووری ئەفریقیا
لەرێگەی دەرکردنی یاساو باجەوە فشاری
زۆر دەخاتە سەر دانیشتووانی رەسەنی
وڵاتەکەو رێگەگرتن لە هاتنی ئاسیاییەکان.
لەو ماوەیەی لەوێمایەوە ماڵەکەی کردە
شوێنی دیدار لەگەڵ تێکۆشەران و
هاورێیانیداو هەژارەکانی کردە ئامانجی کاری
و خۆی فێری کاری فریاکەوتن کردو
داهاتەکانی هەموو بۆ ئەوکارانە خەرج دەکرد
واتا هاوکاریکردنی هندی و هەژارەکان.ئەو
هەزاران عەریزەی بۆ رەشپێستەکان نوسی
دژ بە دەسەڵاتی سپی پێستەکان. هەروەها
رێکخراوی(کۆنگرەی هیندی)
دروستکرد،بڵاوکراوەی(رای هیند)ی دەرکرد
کە بە زمانەکانی ئینگلیزی و سێ زمانی
ناوخۆیی هندی دەریکرد و،لەگەڵ هاوڕێکانیدا

چوونە دەرەوەی شارو ناوچەیەکیان بۆخۆیان دروستکرد بە ناوی (فینیکس) لەساڵی ١٩٠٤. واتە دوای ئەوەی کە بڕیاری دا بمێنێتەوە لە باشوری ئەفریقیا. مانەوەکەی بەهۆی ئەوەوە بوو کە دەسەڵاتداران بڕیاریاندا کە دەرفەت نەدەن بە هندییەکان بەشداری دەنگدان بکەن.بەهۆی شارەزای لەبارەی یاساکانەوە گاندی توانی داوای هندییەکان لە دەسەڵاتداران بباتەوەو بەشداری هەڵبژاردن بکەن. ئەو چەندین جار رووبەڕووی دەستگیرکردن بۆتەوە کە دواینیان لە ساڵی ١٩٠٦ بوو بە هۆی تازەنەکردنەوەی مۆڵەتی مانەوە بە پێی یاسای نوێ کەبەیاسای ئاسیاییەکان ناسرا. بەرامبەر بەو یاسایە خۆپیشاندانی گەورەی هندییەکان دروست بوو ،چینییەکانیش چوونە ریزیان.،بەم هۆیەوە زیندانەکان پڕاوپڕبوون لە ئاسیایی. گاندی هندییەکانی هاندا کە

شاندێک بنێرنە بەریتانیا بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی داواکانیان.گاندی بۆ تێکۆشانی مەدەنی یاسایی دژ بە یاسا ئاسیاییەکە چەند مەرجێکی دانا

١-ئەگەر یاساکە جێبەجێکرا دەبێت بەشداری خۆپیشاندان بکات.

٢-پارە کۆکردنەوە بۆ سەفەری شاندەکە بۆ بەریتانیا.

٣-ژمارەی شاندەکە دیاریکراوبێت.

شاندەکە لەبەیتانیا چاویان کەوت بە وەزیری ناوچە کۆلۆنیالکراوەکان کە لەرووی شاندەکەدا بێزارە خۆی دەربڕی ،بەڵام لەژێرەوە هانی دەسەڵاتدارانی ناوچەکەی باشوری ئەفریقیای دا کە یاساکە جیًبەجێبکات وخودموختاری پێببەخشێت. بۆیە یاساکە جێبەجێکراو گاندی و سەرکردەکانی دیکە خۆپیشاندانەکان دەستگیرگران و دواتر

دەسگیرکرایەوەو،جارێکی دیکە لەساڵی ۱۹۰۸ زیندانی کراوو پاشان بەردرا. گاندی و یاوەرانیهەستیانکرد کەبوونەتە ئامانجی پۆلیس بۆیە بڕیاریاندا کە بەرگەی هەڕەشەولێدان و برسێتی بگرن و پەنانەبەنە بەر توندوتیژی. دەنگوباسی ئازاردانی هندییەکان لە باشوری ئەفریقیا گەیشتەوە هیندستان.بۆی لەژێر فشاری خەڵکدا حالمی وڵات نارەزاینامەیەکی نارد بۆ باشوری ئەفریقیا لەوبارەیەوە. دۆخەکە وەکو خۆی مایەوە تا لەساڵی ۱۹۱٤ دەسەڵاتداران داوای یەکلاکردنەوەی کێشەکەیانکردو،بەشێوەیەک لە شێوەکان چارەکراو،تێکۆشانی ناتوندوتیژی لەوێدا وەبەرهەمهات. ساڵی ۱۹۱٥ گاندی گەڕایەوە هیندستان و دەستی کردەوە بە تێکۆشان لەلایەک رووبەڕووبوونەوەی کێشە کۆمەڵایەتییەکان کە توێژی پەسندنەکراوەکان(المنبوژین) توشی ببون کە

## گاندی بە (منداڵەکانی خودا)ناوی بردن،لەولاشەوە دژ بە داگیرکەری بەریتانی.

لە ئاستی ناوخۆ: لەبەرامبر یاسای جیاوازیکردن و دانانی نوێنەری کەم بۆ پەسندنەکراوەکان لە هەڵبژاردنەکاندا،گاندی بڕیاری مانگرتن تا مردنی دا.ئەمەش لایەنەکانی ناچارکرد رێکەوتنی (بۆنا) مۆربکەن و نوێنەرایەتی پەسندنەکراوەکان زیادبکەن. لەئاستی داگیرکەراندا: بەشێوەیەکی گشتی هەڵوێستی مەبدەئی وتووند بووە بەرامبەر بە داگیرکاری،بەڵام لەوتووندییەوە هەندێک جار نەرمی نواندووە وەکو قۆناغێکی تاکتیکی.بۆنموونە لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانی لەتەک بەریتانییەکاندابووە دژ بەنەیارانیان،هەر لەسەرداوای حاکمی بەریتانیش بەشداری کۆبوونەوەی سەربازی کردووە لە (دلهی)

زۆرجاریش نەیارانی بەمانە تاوانباریانکردووە. بەڵام لە هەمان کاتدا لەساڵەکان ١٩١٨-١٩٢٢ بەراشکاوی زۆر سوور بووە لەسەر سەربەخۆیی هیندستان. لەساڵی ١٩٢٢ یشدا سەرکردایەتی بزاوتێکی جەماوەری مەدەنی کرد دژ بە بەریتانییەکان،کە لە ئەنجامدا پێکدادان روویدا،ئەوەش وایکر کە گاندی بزاوتەکە رابگرێت ،بەڵاَم بەریتانییەکان بڕیاریاندا شەش ساڵ دووریبخەنەوە،بەڵام لەژێر فشاری لایەنگرانیدا ساڵی ١٩٢٤ هێنایانەوەو ئازادیانکرد.

## ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی

ساڵی ١٩٣٤ گاندی دەستیکێشایەوە لە کارکردنی حزبی لەنێو ریزی (حزبی کۆنگرەی هیندستان)و'بەتەواوی خۆی داوە بەرکارکردن لە پێناوی چاکسازی ئابووری کە گوندەکانی هیند پێوەی دەیانناڵاندو،داوەی

لەحزبی پێشووی کرد کەبەشداری
هەڵبژاردنەکانیساڵی ١٩٣٧ بکات کە یاسای
نوێ تائاستێک شەفافیەتی دەستەبەرکردووە
لە هەڵبژاردنەکاندا. بەڵام سەرلەنوێ و
لەساڵی ١٩٤٠ دەستی دایەوە خۆپیشادانی
درێژخایەن وماوەی یەک ساڵی تەواوی
خایاند.ئەو دەم بەریتانییەکان بە شەڕی
جیهانی دووەمەوە خەریک بوون ،بۆیە
وەفدێکیان ناردەلای
بزوتنەوەسەبەخۆخوازەکانی هیند بۆ بارودۆخ
ئارامکردنەوە،بەڵام رازینەبوون.بۆیە لەساڵی
١٩٤٢ گاندی گوتارێکی گرنگی پێشکەشکرد
کە تیایدا بە بەریتانییەکانی گوتبوو( هیند
بەجێبهێڵن تاوەکو رێزدارن) ،بەریتانییەکان
بەم گوتارە رازینەبوون ،بۆیە وێڕای ئەوەی
کە گاندی پشتگیری ئەوانیکردلەشەڕی
جیهانی ،بەڵام خۆی ولایەنگرانی کەوتنە
زیندانەوە،تا لەساڵی ١٩٤٤ ئازادکرا.

لەساڵەکانی ١٩٤٤ و ١٩٤٥ وەختێک کە هیند بەرەوسەربەخۆیی دەڕۆشت مەیلی جوداخوازی لەنێوموسڵمانەکانی ئەوێداسەریهەڵدا بەسەرۆکایەتی(موحەممەد عەلی) ئەمەش بووە هۆی شەڕێکی خوێناوی لەنێوان موسڵمان و هیندۆسەکان،گاندی هەوڵیدا یەکێتی نیشتمانی بپارێزێت،بەڵام بێسوودبوو،تاکارگەیشتە جیابوونەوەو ئەوەش شەڕی هیندوو پاکستانی لێدروست بوو بەهۆی کشمیرەوە. لەنێوخۆی هیندیشدا کەمینە موسڵمانەکان بوونە ئامانجی توندڕەوە هیندۆسییەکان،گاندی بەردەوام داوایدەکرد کەرێزیان لێبگیرێت و ئازار نەدرێن.ئەو هەڵوێستەی گاندی توندڕەوە هیندۆسەکانی تووڕەکرد،بۆیە بڕیاریاندا بیکوژن،ئەوەبوو لە بەرواری ٣٠ی شوباتی ١٩٤٨ لەتەمەنی ٧٨ ساڵیدا بەدەستی توندڕەوێکی هیندۆسی کوژرا.شایەنی باسە

**پێشووتر پێنج جار رووبەڕوی هەوڵی کوشتن ببۆوە.**

## (ستیڤن هۆکینگ)

**ستیفن ویلیام هاوکینگ لەدایکبووی ٨ی کانوونی دووەمی ١٩٤٤ لەشاری هایگەیت لە لەندەن، یەکێکە لە ناودارترین زانایانی بەریتانی لە بواری بیردۆزی فیزیکی لەئاستی جیهان ، کە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە ئینگلستان خوێندوویەتی و پلەی شانازی بڵندی پێبەخشراوە لەبواری فیزیک وە**

لەدوایدا خوێندنی خۆی تەواو کردووە لە زانکۆی کامبریدج کەلەوێ نمرەی دوکتۆرای لە کۆسمۆس پێبەخشراوە کە توێژینەوەی لە بواری زانستی کۆسمۆس کردووە ، لە ساڵی ١٩٧٩ مێدالیای ئالبێرت ئەنیشتیان پێبەخشرا. (فرانک و ئسۆبێل) دایک و باوکی ستیڤن بوون و دوو خوشکی لە خۆی بچوکتر هە یە بە ناوی فیلیپا و مێری.

ستیڤن هۆوکینگ بەم دواییانە کتێبێکی بڵاو کردەوە کە پرسیار لە دروستکەری گەردوون ئەکات کە هەرایەکی گەورەی لە نێو ئاین و ئاین زاکان نایەوە ستیڤن لە پرۆگرامی Curiosity بە رونی باوەری خۆی ئاشکرا کرد کە دەڵێت ساناترین رون کردنەوە بۆ گەردون ئەوەیە کە هیچ خوایەک بوونی نیە، ئەمە ئەم گەیەنێتە دۆزینەوەو ئەنجامێکی بە کەلک کە هیچ دۆزەخ و بەهەشتێکیش بونی

نیە ئێمە هەر یەک ژیانمان هەیە تا دیزاین کراوی مەزن کە گەردونە بەرز بنرخێنین

ستیڤن دەڵێت ئەگەر پێمان وابێ شتێک ئەتوانێ بەبێ دروست بوونی هەبێت ئەو شتە بۆ گەردوون نەبێ لەبری خوداکان ستیڤن نەخۆشی (ALS) هەبوو ، کە نەخۆشییەکە ماسوولکەکان بێهێز دەکات.

## (ستیف جۆبز)

ستیڤن پاوڵ جۆبز ناسراو بە ستێف جۆبز (Steve Jobs)، (ماوەی ژیان: ٢٤ی شووباتی ١٩٥٥ تا ٥ی تشرینی یەکەمی

٢٠١١) داهێنەری ئەمەریکی و کەسایەتیی ناسراو لە بواری تەکنۆلۆجیای زانیاریدا، لە ساڵی ١٩٥٥ لە دایک بووە، یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی کۆمپانیای ئەپڵ، لە ڕێکەوتی ٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١١ دا بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد.

ستیڤ جۆبز، لە رۆژی ٢٤ی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٥ لە سانفڕانسیسکۆ لە دایکبووە و هەر لە سەرەتای ژیانییەوە کێشەی تەندروستی هەبووەو لە ساڵی ٢٠٠٤دا دوچاری جۆرێکی دەگمەنی شێرپەنجەی پەنکریاس هاتووە و لە ساڵی ٢٠٠٩دا نەشتەرگەری چاندنی جگەری بۆ کراوە، لە سەرەتای ٢٠١١ەوە پشووی وەرگرتووەو لە رۆژی ٢٤ی مانگی ئابی ٢٠١١ دەستلەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاند لە پۆستەکەی وەک بەڕێوەبەری گشتیی کۆمپانیای ئەپڵ.

وکی جۆبز بەڕەگەز عەرەب و خەڵکی سوریایە و ناوی عەبدولفەتاح جەندەلیە، ئێستا باوکی جۆبز کە تەمەنی ٨٠ ساڵە و جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی ئوتێل و گازینۆی بۆمتاون لە شاری ڕینۆی هەرێمی نیڤادا. لە ماوەی ژیانیان دا هەم ستیڤ و هەم باوکی ناسنامەی خۆیان شاردۆتەوە نەیان وتووە کە باوک و کوڕن. جەندەلی باوکی ستیف لە ١٨ ساڵیەوە بۆ خوێندن لە سوریاوە چووەتە زانکۆی ئەمریکی لە لوبنان، لە گەڵ هاوڕێ قوتابیەکانیدا لە دژی دەسەڵاتی بەشارە خوری خۆپیشاندانی کردووە، چونکە ناوبراو ویستویەتی زیاتر لە دەسەڵات بمێنێتەوە. کە بارودۆخی سیاسی لوبنان تێک دەچێ، جەندەلی دەچێ بۆ ئەمریکا و دەچێتە دانشگای کۆلۆمبیا بۆ خۆێندن، دوای ساڵێک دەچێتە دانشگای وسکسن و هەر لەو

دانشگایە ماستەر و دکتۆراش لە ئابوری و زانستە سیاسیەکان بەدەس دینی. جەندەلی لە دانشگا ئافرەتێکی بە ڕەچەڵەک سویسری ئەڵمانی دەناسێ بە ناوی جوان کارول و پەیوەندی دەگرن، بەڵام کە ماڵی باوکی کچە دەزانن ڕازی نابن و جیایان دەکەنەوە. کە ستیڤ لە دایک دەبیت دایکی لە سان فرانسیسکۆ دەیدات بە ماڵێکی دەوڵەمەند تا بە خێوی بکەن، ئەوانە پاول و کلار جۆبز بوون کە ستیڤیان کرد بە کوڕی خۆیان. شایانی باسە ستیڤ لە باوکی خوشکێکی تری هەیە بەناوی مونا سیمبسۆن و نوسەرێکی گەورەیە لە ئەمریکاو خاوەنی پێنج رۆمانی نایابە، بەڵام ئەویش بەدەردی ستیڤ چووە و باوکی لە پێنج ساڵیەوە وازی لێهیناوە. جەندەلی تەنها یەک جار وتویەتی کوڕێکم هەیە بەناوی ستیڤ، ئەویش لە چاوپێکەوتنێکدا لە گەڵ ڕۆژنامەی لاس

**فیغاس سەن لە نیسانی ئەمساڵدا. ستیڤ جۆبز خۆی لە ٩١ خێزانی لەگەڵ لۆرین بویلْپێکەوە ناوە وسێ منداڵیان هەیە. ستیڤیش خۆی لە گەڵ ئافرەتیکی تر پەیوەندی هەبووەبەناوی کرستیان بریـنان و کچێکی لێ بووە ودانی پێدا نەناوە لە سەرەتادا، بەڵام دواتر دانی پێدا ناوە و ناوی لیزایە. ستیڤ جۆبز دەڵێ"هەندێ جار ژیان سەرت دەکێشێ بە بەردێکدا بەڵام نابی بێ هیوا بیت"**

**دوای تەنیا ڕۆژێ لەبڵاوکردنەوەی ئایفۆنی s4 دامەزرێنەری ئەپڵ کە پێشووتر دەستی لە کار کێشابۆوە کۆچی دوایی لە ڕێکەوتی ٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١١ واتە لە ٥٦ ساڵی کۆچی دوایی کرد. بەمەش گوزەرێکی گەورەی لە ئەمریکا و ئەپڵدا کە تاڕادەیەک سەرۆکی ئەمریکا باراک ئۆباما هاتە دوان و هاوخەمی بۆ کەسوکاری دەربڕی.**

## (مارک زوکەربێرگ)

مارک ئێلیۆت زوکەربێرگ لەدایک بووی ١٤ی مەی ساڵی ١٩٨٤ ، ناوبراو پیاوی کار و پڕۆگرام سازی کۆمپیوتەر وە یەکێکیشە لەو چوار دامەزرێنەرانی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک , لە ئێستادا سەرۆکی لیژنە و سەرۆکی جێبەجێکارە ، لەساڵی ٢٠١٠ گۆڤاری تایم مارک زوکەربێرگ ی بەپلەی یەکەمی لە ١٠٠ کەسایەتی کاریگەری جیهانی لەو ساڵەدا دەست نیشان کرد

، مارک لە ئێستادا خاوەن ١٩ ملیار دۆلارە بەهۆی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکەی ناسرا لە جیهان ، مارک لە ١٩ی مەی ٢٠١٢ لەگەڵ بریسلا

چان ژیانی هاوسەرگیری پێکهێنا و ژنەکەشی دەرچوی کۆلیژی پزیشکیە لە زانکۆی کالیفۆرنیایە لە سان فرانسیسکۆ وە پێشوتریش ئەم دوو عاشقە لە زانکۆی هارفارد یەکتریان ناسیوە ،تا فێبریوەری ٢٠١٢ لە ٢٨% فەیس بووک لە پشکەکانی مارک زوکەربێرگ بووە بەڵام لە ئێستادا لە ٥٧% پشکەکان هی ئەون

# (بیل گەیتس)

ویلیام هێنری گەیتسی سێهەم سەرۆک و یەکێک لە دوو دامەزرێنەری کۆمپانیای مایکرۆسۆفتە. ئەو زۆر ساڵان دەوڵەمەندترین پیاوی جیهان بووە.

بیل گەیتس ساڵی ١٩٥٥ لە شاری سیاتێل لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە خێزانێکی دەوڵەمەند لەدایک بووە. ئەو هەر لە منداڵییەوە کەسێکی زیرەک و خاوەنی هزرێکی باش بووە. لە ساڵی ١٩٦٨ و لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا یەکەم بەرنامەی کۆمپیوتەریی خۆی نووسی، ئەویش بریتی بوو لە یارییەک کە بەزمانی بەیسیک دروستی کردبوو. لە ساڵی ١٩٦٩ گەیتس و پۆڵ ئالێنی هاورێی پەیوەندییان بە کۆمپانیایەکی کۆمپیوتەرییەوە کرد بۆ ئەوەی بەرنامەیان بۆ دروست بکەن، کۆمپانیاکە

داوای دوو بەرنامەی کرد؛ لە ماوەی هەشت هەفتەدا هەردوو بەرنامەکەیان تەواو کرد. ئەمە بوو کە رێگای خۆش کرد بۆ دامەزراندنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت. دواتر بڕیاریان دا کە شوێنی کۆمپانیاکەی خۆیان بگۆڕن بۆ شوێنێکی گەورە و فراوانتر. لەو کاتە کۆمپانیاکە ژمارەی فەرمانبەرەکانی گەیشتە ١٣ فەرمانبەر و نزیکەی ١ ملیۆن دۆلاریان قازانج کردبوو. دوابەدوای ئەو سەرکەوتن و داهاتە باشەی کە بیل گەیتس لە بواری بەرنامەسازیدا دەستی کەوت، دەستی کرد بە دروستکردنی بەرنامەی وۆرد و ویندۆز. لە ساڵی ١٩٨٦دا ناوی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کەوتە بازاڕەوە و بیل گیتس ژمارەی فەرمانبەرانی گەیشتە ١٢٠٠ کەس بوو بە دەوڵەمەندترین کەس لە ئەمریکا. بیل گیتس لەگەڵ ئەو دەوڵەمەندییە، کەسێکی فەقیردۆست و خێرکەرە.

# داهاتی ساڵانەی گەیتس

بێڵ گەیتس پێشتر یەکێک بووە لەپیاوە دەوڵەمەندەکانی جیهان لەئێستادا خەریکی کاری خێرخوازیە لەپێشوودا داهاتی ساڵانەی بەم شێوەیە بووە:

١٩٨٦ : ٣١٥ میلۆن دۆلاری هەبووە

١٩٨٧ : ملیارێک لەگەڵ چارەکە ملیارێکی هەیە

١٩٩٠ : ٢ملیار و نیو دۆلار

١٩٩٥ : ١٤,٨ملیار دۆلار

١٩٩٧ : ٤٠ ملیار دۆلار

١٩٩٩ : ٨٥ملیار دۆلار

٢٠٠٠ : ٦٠ملیار دۆلار

٢٠٠٨ : ٥٨ملیار دۆلار

**٢٠٠٩ : ٤٠ مليار**

**٢٠١٠ : ٥٣مليار**

**٢٠١٢: ٦١ مليار**

## (ڤلاديمير پوتين)

**ڤلادمير پوتين لە ڕێکەوتی ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٢ز لە سەنت پیتەرزبورگ لە یەکێتیی سۆڤییەت یان ڕووسیاسی ئێستا دایک بووە کە ئەوکات بەو شارەیان دەوت لێنینگراد ، کەسایەتیی سیاسیی ڕووسیە ناوبراو لە بنەماڵەی پوتین لەدایک بووە بۆیە نازناوی**

پوتینی بۆ خۆی هەڵبژاردووە . لەوەتەی ٧ی ئایاری ٢٠١٢ سەرۆککۆماری ڕووسیایە پێشتریش هەمان پۆستی هەبوو لە ماوەی ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٩ تاکوو ٧ی ئایاری ٢٠٠٠. وە هەروەها پێش ئەوەی ببێتە سەرۆککۆماری ڕووسیا لە ئایاری ٢٠١٢ پۆتین سەرۆکوەزیرانی ڕووسیا بوو کە ئەویان لەماوەی ٨ی ئایاری ٢٠٠٨ تاکوو ٧ی ئایاری ٢٠١٢ بوو.لەماوەی ٢٠٠٨ تاکوو ٢٠١٢ش سەرۆکی حیزبی ڕووسیای یەکگرتوو بوو. پۆتین لەسەرەتای لاویدا واتە ١٩٧٥ تاکوو ١٩٩١ لەناو حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤییەتی بوو

## ژیانی سەرەتایی

باوکی ناوی ڤلادیمیر سپایەرووۆنیچ پوتینە و دایکی ناوی ماریا لۆناڤانا یە دایک و باوکی سەر بەخێزانی پوتیننن ، دایکی چێشلێنەری

سەرۆکەکانی یەکێتی سۆڤیەتی جاران بووە لەوانە ڤلادیمیر لێنین و دوای مردنی ڤلادیمیر لێنین لە ساڵی ١٩٢٤ز دایکی پوتین کاری چێشتلێنەری بۆ خێزانەکەی لێنین کە ناوی لێدینژدە کردووە دواتر دووبارە بۆتە چێشتلێنەری سەرۆکی گەڕاوە ئەو جارەیان چێشت لێنەری بۆ جۆزێف ستالینکردووە بەگشتی خێزانەکەی لەبارێکی باش نەبووە

## ڤلادیمیر پوتین و سیاسەت

پوتین کە ئێستا سەرۆک وەزیرانی ڕووسیایە بەیەکێ کە لە کەسیایەتیە دیارەکانی ناوی سیاسەتی ئێستادا هەژمار دەکرێت و پوتین وەرزشکارە و پشتوێنی رەشی هەیە لە یاری جۆدۆ. ئەو ناترسێت لەوەی کە بچێتە ناو کافتریایەکی شەوانەو لەگەڵ هاوڵاتیانی ئاسایی مۆسکۆدا تەماشای یاری تۆپی پێ بکات. بە نیوەروتی وێنە دەگرێ و باکی نیە

لەوەی کە لە راگەیاندنەکاندا بڵاو بێتەوە.پۆتن متمانەی بە خۆی هەیە و یەکێک لەو سەرۆکانەی جیهانە کە جاربەجارجلوبەرگی رەسمی لەبەرناکات، لە پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانیدا بۆینباخ نابەستی و جاری واش هەیە کە جاکەتەکەی دەدات بەسەر شانیدا. ئەمەش ئەو پیاوەیە کە بوەتە پاڵەوانی سەردەمی بوژانەوەی ڕووسیا. پوتین لەبارەی شۆڕشی سووریاوە ووتی دەبێ تەنیا گەلی سووریا بڕیاردەر بێ نابێ هیچ هێز و لایەنێ دژیان بوەستێت هەر بۆیەش ڕووسیا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرووەکاندا ڤیتۆیی خۆی بەکارهێنا دژی هێرشکردنە سەر سووریا .

لەدوای هەڵبژاردن لە ٧ی مەی ساڵی ٢٠٠٠ز بەڕەسمی پارتەکەی پوتین سەرکەوتنی بەدەست هێنا بۆیەکەمینجار ئەو

خوولەش چوار ساڵی خایاند لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٠ بۆ ٢٠٠٤ بوو

خولی دووەمیش بۆ دووەمینجار لەسەر یەک پوتین هەڵبژێردرایەوە بۆ سەرۆکایەتی ڕووسیا ئەو خوولەش لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٤ بۆ ٢٠٠٨ بوو

لە ساڵی ٢٠١٢ پوتین بۆ سێیەم خولی بۆوە بە سەرۆکی ڕووسیا بەڵام ئۆپۆزسیۆنی ڕووسیا پەنجە بۆ پوتین درێژ دەکەن بەتۆمەتی ساختەکاری لە هەڵبژاردنەکان

## خەڵاتەکان

١-ەڵاتی تایبەت و مەزن لە ئەمریکا لەساڵی ٢٠٠١ وەری گرتووە

٢-لە ساڵی ٢٠٠٦ خەڵاتی ڕێزلێنانی لە فەڕەنسا پێ بەخشرا

٣-لە ساڵی ٢٠٠٧ لەلایەک گۆڤاری تایم خەڵات کرا و بە ١٠٠ کاریگەرترین سیاسەتمەداری جیهان دەست نیشانکرا لەلایەن هەمان گۆڤارەوە

٤-لە ساڵی ٢٠١٤ کاریگەرترین و یەکەم کەسایەتی لە جیهان دەستنیشانکرا و لە ساڵانی پێشووتریش چەندین خەڵاتی گرینگ و تایبەتی وەرگرتووە

## (دمیتری مێدڤێدێڤ)

دمیتری مێدڤێدێڤ لەدایکبووی ١٤ی ئەیلوولی ١٩٦٥) کەسایەتیی سیاسیی ڕووسییە و دەیەمین سەرۆکوەزیرانی ڕووسیایە لە ٨ی ئایاری ٢٠١٢وە. پێش

ئەوەی ببێتە سەرۆکوەزیران، سەرۆککۆماری ڕووسیا بووە لە ماوەی ٧ی ئایاری ٢٠٠٨ تاکوو ٨ی ئایاری ٢٠١٢.

لە ئێستادا مێدڤێدێڤ لە پۆستی سەرۆکی حیزبی یەکگرتووی ڕووسیادایە ( United Russia). هەروەها لەماوەی ١٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٥ تاکوو ١٢ی ئایاری ٢٠٠٨ جێگری یەکەمی سەرۆککوەزیرانی ڕووسیا بوو. مێدڤێدێڤ تاکوو هەڵوەشانەوەی یەکێتیی سۆڤیەت لە ١٩٩١ لە حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەت بووە ئینجا لە ١٩٩١ تاکوو ٢٠١١ لە حیزبی سەربەخۆیی ڕووسیا کاری کردووە. پاشان هاتە ناو حیزبی یەکگرتوویی ڕووسیا لە ٢٠١١ تاکوو ئێستا. لەساڵی ١٩٨٧ بووە خاوەن بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە یاسا لە زانکۆی لێنینگراد و لەساڵی ١٩٩٣ لەگەڵ سڤێتلانا مێدڤێدێڤا

(Svetlana Medvedeva)
هاوسەرگیری کردووە و خاوەنی منداڵێکن
بەناوی ئلیا (Ilya).

## (جۆرج دەبلیوو بوش)

جۆرج دەبلیوو بۆش یان جۆرج واکێر بۆش لەدایک بووی ٦ی جووڵای ساڵی ١٩٤٦ ، ناوبراو بازرگان و کاندیدی پارتی کۆماری ئەمریکا بووە وە چل و سێهەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە لەنێوان (٢٠ی جانێوەری ساڵی ٢٠٠١ تا ٢٠ی جانێوەری ساڵی ٢٠٠٩)

جۆرج بوش بەرلەوەی بچێتە ناو جیهانی سیاسەتەوە بازرگان بوەو چەندین کۆمپانیای نەوتی بەڕێوەبردووە، لە ساڵی ١٩٨٩ بۆ ١٩٩٨ یەکێک بووە لە خاوەنی یانەکانی تەکساس رەنجەر بۆ یاری بەیس بۆڵ، لە ساڵی ١٩٩٥ بۆ ساڵی ٢٠٠٠ حاکمی تەکساس بووە. لە بنەماڵەکەی جۆرج بوش دا چەند سیاسەتمەدارێکی ناودار بەدەرکەوتوون، لەوانەش جۆرج هربرت وۆڵکەر بوشی باوکی کە ماوەی ٤ ساڵ سەرۆکی ئەمریکا بووە (جب بوش)ی براشی حاکمی ویلایەتی فلۆریدایەو برسکت بوشی باپیریشی ئەندامی ئەنجومەنی پیران بووە. جۆرج بوش لە ساڵی ١٩٧٧ دا ژیانی هاوسەری لەگەڵ خانمی یەکەمی وڵات لۆرا بۆشدا پێکهێناوە، خاتو لۆرا لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٦ لە میلاندی سەر بە ویلایەتی تەکساس لە دایک بووەو بڕوانامەی

بەکەلۆریای لە زانستی پەروەدەدا لە زانکۆی ساسرن میسۆدیست بەدەست هێناوەو لەساڵی ١٩٧٣شدا بڕوانامەی ماستەری لە بواری زانستی کتێبخانەدا لە زانکۆی تەکساس لە شاری ئۆستن وەرگرتووەو خاوەنی دوو منداڵی کچن بە ناوەکانی بارباراو جەنا.

## (باراک ئۆباما)

باراک حوسێن ئۆبامای دوهەم ە دایک بووی ٤ August ساڵی ١٩٦١ لە ویلایەتی هاوایی ، ئەندامی حیزبی دێموکراتی ویلایەته

یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، سیناتۆری
ویلایەتی ئیلینووا ، چل و چوارەمین سەرۆک
کۆماری ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا و
هەروەها هەڵگری خەڵاتی ئاشتیی نۆبێله.

ئۆباما لەویلایەتی کانساس هاوای له باوکێکی
کینی و دایکێکی ئەمریکی سپی پێست له
دایک بووەدوای تەمەنی دوو ساڵیدا باوکی
دوای ئەوەی گەراوەتەوه بۆ کینیا بەجێی
هێشتووەو لای دایکی ماوەتەوەو دایکی
پەروەردەی کردوه، دوای ئەوەی دایکی
ئۆباما شودەکاتەوه به پیاوێکی قوتابی
ئیندۆنیسی به منداڵی دەگوازرێتەوه بۆجاکارتا
له گەڵ خێزانەکەی و له دایکەوه خوشکێکی
دەبێت بەناوی (مایا) نوسەری ناودار
سکوتتۆرۆ دەڵێت ئۆباما بۆماوەی دووساڵ له
قوتابخانەیەکی ئیسلامی دا خوێندویەتی دواتر
پەیوەندی کردوه به خوێندنگەیەکی کاسۆلیکی
و پاشان بووه بەمەسیحی له ساڵی ١٩٩٥

دواتر دایكی بە نەخۆشی ژێر پەنجە
مردووەلە یادەوەریەكانیدا ئۆباما
یادەوەریەكانی خۆی و دایكی نوسیوەتەوە.
دوای ئەوەی ئۆباما پەیوەندی دەكات بە
زانكۆی كالیفۆرنیا و بەر لەوەی بچێتە
زانكۆی كۆلۆمبیا لە نیویۆرک كە دواترلە
ساڵی ١٩٨٣ لێی دەرچوەو بروانامەی
بەكالۆریس ی لە زانستی سیاسی و پەیوەندی
دەوڵەتی وەرگرتوەو دواتر لە بواری ئەهلیدا
كاریكردوە بۆ هاوكاری هەژاران و
لانەوازان،جگە لەوەش وەک نوسەرو
لێكۆڵەرەوەی ئابوری بۆ رێكخراوی (بزەنس
ئەنتەر ناشیونال كۆربۆ رەیشن) كاریكردوە،
ساڵی ١٩٨٥چوەتە شاری شیكاگۆ دوای
ئەوەی كە كارێكی دەست كەوتووە بوەتە
بەرێوەبەری پرۆژەی بوژانەوەی گەرەكە
هەژار نشینەكان ، لەساڵی١٩٩١ زانكۆی

یاسای لە هارفارد تەواوکردوەو بوەتە وانەبێژ لە زانکۆی شیکاغۆ بۆ ساڵی ١٩٩٣ .

ساڵی ١٩٩٦ هەڵبژێردراوە بۆ ئەنجومەنی پیران لە ئیلینۆی و بە شێوەیەکی فەرمی چوەتە نێو پارتی دیموکراتخوازی ئەمریکاو لە نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٤ لە هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس دەرچوە بۆ ویلایەتی ئیلینۆی بەرێژەی ٧٠% لە کۆی دەنگەکان لە بەرامبەردا رکەبەری جمهوری٢٧% ی هێناوە هەر بۆیەش بووە منداڵترین ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکاو لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا بۆ ساڵی ٢٠٠٨ خۆی پاڵاوت و دەرچوو ئێستاش سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە بۆ جاری دووەم، لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا رۆژنامەی (یەدیعۆت ئەحرۆنوت)ی ئیسرائیلی و پێگەی(ئینت) زۆر

بەراشکاوانە پشتگیریان لێکردو ئەم
هەواڵەش زۆر بڵاو بوەوە بەڵام ئۆباما دوای
بڵاو بوونەوەی هەواڵەکان ئەم پشتگیریەی بە
موبادەرەیەکی تاکەکەسی وەسفکردو وتەکانی
لە پێگەی (واینت) گۆران. لە وتلرەکەشیدا کە
لە بەردەم رێکخراوی (ئیبپاک) ی ئیسرائیلدا
بۆ ئامادەبوان دابووی وتی: قودس بە
پایتەختی ئیسرائیل دەمێنێتەوەو پێویستە بە
یەکگرتووی بمێنێتەوە، کە میدیاکانی جیهانی
ئیسلامی بەتەواوی وروژاندو سەرکردایەتی
فەلەستین و حیزبەکانی فەلەستین بەتوندی
وەڵامی ئەو لێدوانانەی ئەوکاتی ئۆبامایان
دایەوەو دواتر لە چاوپێکەوتنی کەناڵی (سی
ئێن ئێن) لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا وتی: ئەم
بابەتە بەجێ دەهێڵین بۆ رێکەوتن و وتو
وێژی هەردوو لایەنی ناکۆک کە
فەلەستینیەکان و ئیسرائیلن ، لە رۆژی ٥ ی
نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٨ دوای راگەیاندنی

ئەنجامەکانی ئەو هەڵبژاردنە بە سەرۆکی
ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەڵبژێردراو
دوای ئەوەی کە بوە سەرۆک بریاری
کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکای دا لە عێراق
کە لەکاتی هەڵمەتەکانی پروپاگەندەی
هەڵبژاردنەکاندا بانگەشەی دەکرد بۆ
گێرانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق و
ئەفغانستان بەڵام ئەو بریارە تەنها بۆ عێراق
بوو لە بەرامبەردا هێزەکانی ئەمریکا لەسەر
خاکی ئەفغانستان تا ئێستاش ماونەتەوە
هەرچی ئەو هێزانەشی کە لە عێراق بوون بۆ
ناوچەکانی کەنداوو ئەفغانستان گوێزرانەوەو
سەبارەت بە بەڵێنەکانی بۆ نەهێشتنی
گرتووخانە نایاسایيەکانی تا ئێستا
بەبێچارەسەر ماونەتەوە بە تایبەتی
گرتووخانەکانی گۆنتانامۆ کە بوەتە مایەی
شەرمەزاری بۆ ئەمریکاو لە سەردەمی
دەستەڵاتی جۆرج بۆش دروستکراون،

ئۆباما کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی هەیە
هەمیشە دەیەوێ وەک کەسێکی سادە
دەربکەوێط نەک کەسایەتی ساسەتمەندار لەو
ڕوانگەیەوەش چەندین هەنگاوی ناوە وەک :

١-لە سەری ساڵدا وەک کەسێکی ئاسایی
چوو بۆ شەڕە بەفر

٢-هەمیشە لەیاریەکانی خولی NBA
باسکەی ئەمریکی ئامادە دەبێت و لەکۆتایی
خوولەکەدا خەڵاتی تایبەت دەبەخشێتە
ئەستێرەکانی خوولەکە

٣-زۆرکات دەچێتە چێشت خانە سادەکان وە
خواردنی سادەش دەخوات وەک هەمبرگر و
ماسی

٤-هەمیشە ئارەزووی لەبەرکردنی جلوبەرگی
سادە دەکات

# (کیم جۆنگ ئون)

کیم جۆنگ ئون لەدایکبووی ٨ی کانوونی دووەمی ١٩٨٣ لەپیۆنگیانگ لە کۆریای باکوور . کەسایەتی سیاسیی کۆریای باکوورە و لەوەتەی ١٧ی کانوونی یەکەمی ٢٠١١ بووەتە سەرۆکی کۆریای باکوور ئەمەش دوای مردنی باوک و باوەگەورەی کە لەهەمان پۆستدا بوون ، دواتریش لەوەتەی ١١ی نیسانی ٢٠١٢ بوو بە سکرتێری گشتی حیزبی کرێکارانی کۆریا. پێشتریش چەندین پلە و پۆستی لە وڵاتەکەی وەرگرتبوو وەک سەرۆکی هێزی نیشتمانیی کۆریا و چەندین پلەی تر.

## (حوسێن کوڕی تەلال)

حوسێنی کوڕی تەڵال' ، (ماوەی ژیان:١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٣٥ لە عەممان لە ئەردەن تاکوو ٧ی شووباتی ١٩٩٩)، شای شانشینی ئودن بووە لەماوەی ١٩٥٢ تاکوو ١٩٩٩ دوای ئەوەی خۆێندنی قۆناغی سەرەتایی لە عەممانی ئەردەن تەواوکردووە، ڕۆشتووە بۆ زانکۆی فیکتۆریا ئەسکەندەرییەی میسڕ، دواتر لە قوتابخانەی هارۆ لە ئینگلتەرا خوێندوێتی و خوێندنی سەربازیشی لە ئەکادیمیای ساندهێریتی سەربازی شانشینی لەئینگلتەرا تەواوکردووە. لە ساڵی ١٩٥٢ حسێنی کوڕی تەڵال

لەتەمەنی ١٧ ساڵیدا کراوە بە شای ئوردن، زۆر فڕۆکەوانێکی بەتوانابووە و لە ماتۆڕ لێخوڕین و پێشبڕکێی ئۆتۆمبیلیشدا زۆر باش بووە هەروەها حەزری لەمەلەکردن و خلسکانێ و تێنس بووە، دوای ئەوەی بۆتە شای ئوردن پەیماننامەی بەریتانیای هەڵوەشاندۆتەوە و ڕتیکردۆتەوە لەڕێگای ئوردنەوە بنکەکانی ئینگلیز دەستدرێژی بکاتە سەر میسر، هەر لەسەردەمی ئەودا سووپای ئوردن هێرشیان کردۆتە سەر ئیسرائیل . شا حوسێن لەدوای ئەوەی دەسەڵاتی ئوردونی گرتۆتە دەست گرنگی بە بواری ئابوری و پیشەسازی داوە و هەموو ڕێگا و بانی وڵاتەکەی نوێکردۆتەوە، هەروەها ئاستی ڕێژەی خوێندەواری لە ٣٣% بەرزکردۆتەوە بۆ زیاتر لە ٨٥ %، هەروەها کاری لەسەر ئەوە کردووە ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەرپابکات و یەکێک لەکارەکانی ساڵی ١٩٩٤

واژووی لەسەر پەیمانی ئاشتی نێوان ئیسرائیل و فەلەستین کردووە و ئەنجوومەنی نێودەوڵەتی بە جەنگاوەری هێنانەدی ئاشتی وسفی کردووە. شا حوسێن بێچگە لەژیانی سیاسی چوار کتێبی بەهەم هێناوە و لەژیانی کۆمەڵایەتیدا چوار جار ژنی هێناوە و ١١ منداڵی هەبووە، لەدوای ئەوەی دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە بۆتەوە لە ٧ شووباتی ساڵی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کردووە.

## (ئاریێل شارۆن)

ئاریێل شارۆن (ماوەی ژیان:٢٦ی شووباتی ١٩٢٨ تاکوو ١١ی کانوونی دووەمی

٢٠١٤) کەسایەتی سیاسی ئیسرائیلییەو، شارۆن یازدەمین سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل بووە کە ماوەکەی ٧ی ئازاری ٢٠٠١ تاکوو ١٤ی نیسانی ٢٠٠٦، وە لەچەندین کابینەی حکوومەتەکانیش وەزیر بووە لەوێنەی وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل بووە لەماوەی ١٣ی تشرینی یەکەم تاکوو ٦ی حوزەیرانی ١٩٩٩ وە وەزیری وزە و سەرچاوە ئاوییەکان و وەزیری خانووبەرە و بەرهەمهێنان و وە وەزیری (پیشەسازی-بازرگانی و کار) بووە وە وەزیری بەرگری ئیسرائیل بووە، لەدوای مردنی شارۆن لە ١١ی کانوونی دووەمی ٢٠١٤ لە ئیسرائیل ماتەمینی ڕاگەیندرا بەڵام لە فەلەستین و ئێران و چەند وڵاتێکی عەرەبی هاوڵاتییان خۆشحاڵکرد، شارۆن لەساڵی ١٩٨٢ رۆڵی هەبووە لە داگیرکردنی باشووری لوبنان لەلایەن ئیسرائیلەوە کە ئەوکاتەبووە کە

شارۆن وەزیری بەرگری ئیسرائیلی بووە و هەر لە لوبنانیش شارۆن تۆمەتبارکراوە بە کوشتارگەی سەبرا و شاتێلا لە لوبنان.

## (مایکڵ جاکسن)

مایکڵ جۆزیف جاکسۆن لە ٢٨ی ئابی ١٩٥٨ لەدایکبووە، یەکەم جار لە تەمەنی ١١ ساڵیدا لەسەر تەختەی شانۆ دەرکەوت کاتێک ئەندامی تیپی(جاکسۆن فایف) بوو کە لە خێزانی مایکڵ پێکهاتبوو، حەوتەم کوڕی بنەماڵەکەی بوو کە لە نۆ خۆشک و برا پێکهاتبوون (مایکڵ، ڕۆبی، جاکی، تیتۆ، جیرمان، لاتۆیا، مارلۆن، براندی، جانێت). جۆزیف والتەری باوکیان گرفتی زۆری هەبوو

لەگەڵ ئەم منداڵانە، وا باوڕ دەکرێت کە ئەمە هۆکاری ئازاری منداڵان لە لایەن مایکڵەوە بووە. لە ساڵی ١٩٩٣ بۆ یەکەم جار مایکڵ جاکسۆن لە ئەڵقەیەکی بەرنامەی ئۆپێرا وینفری باسی لە ناخۆشییەکانی تەمەنی منداڵی خۆی کرد و گوتی: "من لە تەمەنی منداڵیدا هەمیشە هەستم بە تەنیایی دەکرد و پەشیمان بووم لەوەی باوکێکی وەک جۆزیفم هەیە، بۆیە هەمیشە بە تەنیا دەگریام".

لە چاوپێکەوتنێکی راستەوخۆدا لە ساڵی ٢٠٠٣ کاتێک سەرەڕای ئەم هەموو دەردەسەری و ناخۆشییانە بەهرە و تواناکانی مایکڵ هەر لە تەمەنی منداڵییەوە هەستی پێدەکرا بەتایبەتی کە لە تەمەنی ٥ ساڵیدا لە ئاهەنگەکانی سەری ساڵ و لە قوتابخانە گۆرانی دەگوت، لە ساڵی ١٩٦٤ برا گەورەکەی جاکی تیپێکی مۆسیقای

دامەزراندن بەناوی "جاکسۆن برازەرس" و
مایکل لەگەڵ براکانی وەک
کورەس(گۆرانیەکی چەند کەسی) گۆرانی
دەگوت و سەمای دەکرد، لە ساڵی ١٩٧١
مایکڵ بە تەنیا دەستی بە گۆرانی گوتن کرد و
چەندین ئەلبوومی بڵاوکردەوە کە سەرکەوتنی
بێ وێنەی تۆمار بەدەستهێنا، لە هەشتاکانی
سەدەی رابردوودا جاکسۆن یەکەم رەش
پێست بوو بگاتە ئاستێکی جیهانی بەرز و
ئاراستەی گۆرانی جیهانی لە گۆرانی
ئاساییەوە گۆڕی بۆ (گۆرانی ناوبانگ
دەرکردن و دروستکردن، گۆرانییەکانی مایکل
مەودایەکی مرۆڤانەشیان هەبوو
بەتایبەتی(earth ،Black or white)
جگە لە گۆرانی مرۆڤانە، مایکل رێکخراوێکی
خێرخوازی تایبەت بەخۆی دامەزراندن کە
هاواکاریی پێشکەش بە ٣٩ رێکخراوی
خێرخوازی سەربەخۆ دەکات، بەمەش مایکڵ

بوو بە یەکێک لەو گۆرانیبێژانە کە دواجار ناوبانگی دەرکرد.

یەکێک لە خاڵە جیاکەرەکانی ژیانی مایکڵ جاکسۆن ئەوەیە کە بەهۆی ئەنجامدانی چەندین نەشتەرگەری جوانکاری لە ماوەی چەند ساڵێکدا توانی رەنگی پێستی خۆی لە رەشی بگۆڕێت بۆ سپی، ئەم نەشتەرگەریانەش بڕێکی زۆر پارەی تێچوو کە جگە لە خەرجییە زۆر ئەم نەشتەرگەیانە کاریگەرییەکی سلبیان لەسەر تەندروستی رابردوو تووشی نەخۆشییەکی دەگمەن و نادیار هاتبوو لە سییەکانی، هەروەها پێستی لەشی دووچاری تێکچوون و هەڵوەرین هاتبوو و لەئەنجامی ئەو نەشتەرگەییە زۆرانەی بۆ کرابوو جۆرە کرمێک لە پێستی پەیدابببوو، ئەیان هالبرین کە نووسەرێکی کەنەدییە و خەریکی نووسینی کتێبێکە لە

سەر ژیانی جاکسۆن دەڵێ: لە ساڵانی ڕابردوودا باری تەندروستی بەرەو خراپی دەچوو تەنانەت توانای ئەوەی نەمابوو کە نەشتەرگەریشی بۆ ئەنجام بدرێت، کە زۆر پێویست بوو چاوی لای چەپی ٩٥% ی توانای بینی نەمابوو لە ئەنجامی نەخۆشی سییەکانی، هەروەها توانای قسەکردنیشی زۆر نەبوو.

دوای ڕاگەیاندنی مردنی مایکڵ، ئەندامانی کۆنگرێس دەقیقەیەک وەستان بۆ ڕێزگرتن لە گیانی، لە لایەکی دیکەوە پزیشکان توێکاری لاشەی مایکلیان کرد، بەڵام ڕایانگەیاند لە کاتی زوودا ناتوانن هۆکاری مردنی دیار بکەن، هەر چەندە بەپێی پێشبینییەکان هۆکاری مردنی بۆ ئەو دەرمانە زۆرانە دەگەڕێتەوە کە بەکاری دەهێنان بۆ نەهێشتنی ئازارەکانی لەشی، هەر لە مردنی بە نیو

**کاتژمێرێک بڕێکی زۆر دەرمانی دیمیرۆلی بەکارهێنابوو کە رۆژانە بڕێکی وەردەگرت بۆیە خێزانی مایکل پێیان وایە هۆکاری مردنی بۆ ئەو بەڕ زۆرەی ئەو دەرمانە دەگەڕێتەوە، لەلایەکی دیکەوە بەرپرسێکی پۆلیسی لۆس ئەنجلۆس رایگەیاند جاکسۆن هۆگری بەکارهێنانی دەرمانی ئۆکسیکونتین بوو، بەڵام هیچ نیشانەیەکی برینداربوونی دەرەکی بەسەر لاشەی جاکسۆنەوە نەبووە. دواى ئەوە لاشەی جاکسۆن درایەوە خێزانەکەی پۆلیس لێکۆڵینەوەیەکی وردی لەگەڵ ئەو پزیشکە ئەنجامدا کە لە کاتی گیان لە دەستدانی لەگەڵی بوو ئەویش هاوکارییەکی زۆری پۆلیسی کردووە، بەڵام پشکنینی ژەهرەکان کە هۆکاری مردنی دیاردەکات پێویستی بە شەش تا هەشت هەفتە هەیە ئەنجامەکانی دەردەچێت، برایان ئۆکسمان پارێزەری خانەوادەی جاکسۆن گوتی: من**

زۆر نیگەران بووم لە بەکارهێنانی ئەو بڕە
زۆرەی دەرمانانە لەلایەن جاکسۆنەوە و زۆر
جار خێزانەکەیم ئاگاداركردۆتەوە لەو
زیانانەی کە لە ئەنجامی سەما کردن تووشی
دەبێت و رەنگە ژیانیشی بخاتە مەترسییەوە،
بەڵام کەس گرنگی بە قسەکانی من نەداوە،
برایان هەروەها گوتی: من نامەوێ ئاماژە بە
هیچ شتێک بدەم تاکو ئەنجامی پشکنینی
ژەهرەکان دەرنەچێت، هەر بەپێی قسەکانی
برایان لە چەند هەفتەی رابردوودا جاکسۆن
خەریکی خوێندنەوەی نووسینەکانی تاکور
بوو. دوایین شەوی ژیانی لەلایەکی دیکەوە
قسەو باسێکی زۆر دەربارەی رووداوەکانی
دوایین شەوی ژیانی مایکل بڵاوکراونەتەوە،
بەپێی ماڵپەڕی(TMZ) مایکل لە دوایین
شەوی لە (ستیبلێس سەنتەن )بەسەر برد لە
خۆ ئامادەکردن بۆ زنجیرەی ئەو ئاهەنگانەی
کە بڕیارە ئەنجامی بدات، چونکە تا درەنگانی

شەو خەریکە گۆرانی و سەماکردن بوو بە یاوەری ژمارەیەک لە سەماکاران و ئەندامانی تیپەکەی، بەپێی شایەد عەیانێک ئەو شەوە مایکل سێ کاتژمێر لە کاتی دیاریکراو دواکەوت و سەماکاران ناچار بوون چاوەڕێی بکەن، لەلایەنی خێزانییەوە ئێستا هەر سێ منداڵەکەی مایکل (پلاکێنت و پاریس و برنس) لەگەڵ دایکی مایکل دەژین و بەپێی قسەی برایانی پارێزەر منداڵەکانی بەهرەی زۆریان هەیەو دەتوانن رووبەڕووی ئەم بارودۆخە ببنەوە هەر چەندە ئێستا زۆر باسی دەکەن و ئەم رووداوە وەک شۆکێک بووە بۆیان.

# (تووپاک شاکوور)

ڕاپەر و ئەکتەری جیهانی ( Tupac Amaru Shakur) یان بە ناوی ستەیج ناوی بنێین (توپاک) وە نازناوی دڵخوازی خۆی (ماکیاڤێلی ، Makaveli)لە ١٩٧١/١/٦ لە ویلایەتی (نیویۆرک)ی سەر بە ئەمەریکا لەدایک بووە.شاکور زیاتر لە ٧٥ ملیۆن فرۆشیاری ئەلبومەکانی هەیە لە سەرتاسەری جیهاندا، لەبەر ئەمە ناوی چۆتە (باشترین و پڕ فرۆشترین هونەرمەند لە هەموو کاتێکدا)، وە نازناوی باشترین ڕاپەری لێ دەنرێت لەلایەن زۆربەی گۆڤارەکانەوە.لەوانەRolling Stone کە ناوی خستە (٨٦)ـەمین گۆرانیبێژی جیهان لە هەموو کاتێکدا،جار و باریش پێی دەڵێن باشترین ڕاپەر لەوکاتەوەی ڕاپ هەیە،بۆ نموونە ڕیزی ژمارە دووی وەرگرت لە لیستی

MTV بۆ ساڵی ٢٠٠٦ وە نازناوی کاریگەرترین ڕاپەر لە هەموو کاتێکدا،ئەلبومی دووەمی کە ناوی All Eyez On Me بوو ، بوو بە پڕفرۆشترین ئەلبوم لە هەموو ئەمەریکادا. توپاک،پیشەی سەرەتای بە (دانس) و (بەڕێوەبەری ئاهەنگەکان) و (ڕاپ)دەستپێیکرد لە گروپی Digital Underground. ڕووکاری گۆرانییەکانی توپاک شاکور باس لە توند و تیژی و تەنگی و ناڕەحەتییەکانی ناو جەرگەی شارەکان و ڕەگەز پەرستی و کێشەکانی تری کۆمەڵگایە. هەردوو دایک و باوکی ئەندام بوون لە گروپی Black Panther Party کە بیرۆکەی گروپەکە لە گۆرانییەکانی توپاکدا ڕەنگ دەداتەوە. لە کۆتاییەکانی پیشەکەیدا،شاکور تێوەگلا لە بەربەرەکانی نێوان کەناری ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکا،وە بەشداربوونی لەو

پێكدادانە لەگەڵ ڕاپەرانی تر،دەرهێنەرانی تر،ستاف و ستۆدیۆی ڕاپەرانی تر، بەناوبانگترینیان The Notorious B.I.G وەكۆمپانیا میوزیكییەكەی بەناوی Bad Boy Records لە حەوتەمین ڕۆژی مانگی ٩ ساڵی ١٩٩٦ ، شاكور چەند فیشەكێكی پێوەنرا لەلایەن سەیارەیەكی لاتەنیشتەوە لەسەر ڕێگای Flamingo ، لە ویلایەتیNevada ,Las Vegas ، دواتر برا بۆ نەخۆشخانەی زانكۆیی ناوەند لە باشوری Nevada،كە دوای شەش ڕۆژ مانەوەی هەر لەوێ مرد.

تەواو...


DW4.ME
هەموو سەرکردەیەک
سەرەتا منداڵێکی گرینۆک بووە
هەموو تەلار و کۆشکێکیش
سەرەتا نەخشەی سەر پەڕەیەک بووە
گرنگ نی یە ئێستا تۆ چییت..
گرنگ ئەوەیە سبەینێ ئەبیت بە چی..!!